


ئاستانە

# سیستەمی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا

نوسینی : عبدالله ناصح علوان
وەرگێڕ: شاخەوان حسن

# سیستەمی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا


نـــاوی نووســـــەر: عبدالله ناصح علوان

نـــاوی وەرگێڕ : شاخــــەوان حەســەن

پێـداچـــوونەوە : مــەریوان عــــارف

دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی

نۆبــەتـی چـــــاپ: دووەم ٢٠٢٠

تـیــــــــراژ: ١٠٠٠ دانـــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (       ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

# سیستەمی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا

نووسینی

**عبدالله ناصح علوان**

وەرگێڕانی

**شاخەوان حەسەن**



ASTANA

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی خوا دەکەین لەسەر گشت نیعمەتەکانی و صەڵات و سەلام دەنێرین بۆ سەرگیانی پاکی خۆشەویستمان محمد ﷺ بۆ سەر خاو خێزان و هاوەڵان و شوێن کەووتوانی تاوەکو ڕۆژی دوایی ..

خوای گەورە پێغەمبەرانی (علیهم السلام) ناردووە بە پەیامێك کە شایستە و گونجاو بێت بۆ ئەو شوێن و کاتەی کە گەل و هۆزەکانی تیادا ژیاوە ، پەیامێك هاوسەنگ بووە لەگەڵ ژیان و گوزەرانیاندا، دوور بووە لە ئاڵۆزی و تێککیران لەگەڵ فیترەتیاندا گونجاو بووە لەگەڵ تێگەشتنیاندا، بە ئاسانی توانیویانە لێی تێبگەن و پیادەی بکەن کە ئەمەش بەشێك بووە لە سۆز و ڕەحمی ئیلاهی کە بارێکی بەسەر شان نەداون توانای هەڵگرتنیان نەبوو بێ، دژ و ناکۆك بێ بە ناخیان، ناساز بێ بە سیستمی کۆمەڵایەتیان، ئاینی ئیسلامیش وەك دوا پەیامی خوایی کە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی هاتووە و گرێدراوی هەموو کات و شوێنێکە، بۆ گشت چین و ڕەنگ و زەمانێکە، بۆیە دەبێت هەڵگری کۆمەڵێك خاسیەت بێت کە کۆك و گونجاو بێ، بە پێی کاتە جیاواز و شوێنە گۆڕاوەکان، تەواوی گۆڕانکاری یەکان بەسەر مرۆڤایەتیدا دێت لە خۆدا جێبکاتەوە، کۆمەڵە ڕێسا و یاسایەك دابنێت کە نەگۆڕ بێت بە گۆڕانی کات و شوێنەکان، کە دیارە پەیامێك لە لایەن خوایەکی عەلیم و خەبیرو ئاگاداربە ڕابردوو

و ئێستا و داهاتوو بێت، بێگومان هەر ئەو زاتەش (جل جلاله) دەزانێت کامە یاسا نەگۆڕ بکات و کامەشیان گۆڕاو، کامە بابەت بەیەکجاری حەرام و قەدەغە بکات و کامەی تر ڕێپێدراوو دروست و حەڵاڵ، هەندێکی تر پێویستی بە کات و زەمەنێکی دیاریکراوە تا ئەم دوا پەیامە بتوانێت هاوتەریب بە ڕاهێنانی کۆمەڵگا بۆ قبوڵ کردن و وەرگرتنی بە تێپەڕبونی کات قەدەغەی بکات، یەکێك لە و عورفە باوانەی کۆمەڵگا کۆیلەیەتی بووە، دیاردەیەك ڕۆچوو بە ناخی مێژوودا، تێکەڵ بو بە عورفی کۆمەڵگا، سەرچاوەیەکی گرنگی بازرگانی، لەبەرئەمانە ئیسلام بە ئاسانی و بە دەقێك نەیتوانیوە بنەبڕی بکات، چونکە کۆمەڵگا ڕانەهاتووە لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانەدا، هەر لەبەر ئەمەیە بۆ بنەبڕ کردنی کاتێکی پێویست بووە.

ئیسلام بە سیستمێکی دروست و کۆمەڵە ڕێ و شوێنێکی گونجاو لە زەمەنێکی کورتخایەن توانی کۆمەڵگا ڕابهێنێت، تا ئەم دیاردە مێژوویە بنەبڕ بکەن، دوبارە کەرامەت بۆ مرۆڤ بگەڕێننەوە، هەرچەند قەدەغەکردنی یەکجاری بەستەوە بە قەدەغەکردنی سیستمی جیهانی یەوە، کەدیارە لەم نامیلکەیە زۆر بەڕونی باسی دەکات.

ئەوەی جێگەی لەسەرووەستانە لە ئێستادا و دەبینرێت و دەبیسترێت لە لایەن هەندێك بە ناو ڕۆشنبیرو خوێنەواری عەلمانی یەوە هێرشێکی ناڕەوایە بەرامبەر ئیسلام لە بابەتی کۆیلایەتی و تۆمەتبارکردنێتی بەپێشێل کردنی ئازادی یەکانی مرۆڤ، ڕەحنەو توانجیانە لە ئیسلام کە بۆچی  کۆیلایەتی قەدەغە نەکردووە؟ بێ ئاگان لەوەی ئیسلام توانیوێتی ڕووبەڕوی ئەم عورفە خراپەی کۆمەڵگا ببێتەوە، بە دانانی کۆمەڵە یاسایەك بنەبڕی بکات، بەجۆرێك لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا

تاکە کۆیلەیەك نەمێنێت، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە و شایەنی هەڵوێستە کردنە دەرکەوتنی هەندێك موسڵمان کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام یان دەدرێنە پاڵ ئیسلام، و لە ژێر ناوگەلی جۆربەجۆردا دێن و دووبارە ئەم گومان و بوهتانانەی کە خەڵکانێکی دژ بەدین و ڕۆژهەڵاتناسانی نەصرانی ڕق لە دڵ بوو بەرامبەر ئیسلام گەرم دەکەنەوە و دەیکەنە تۆمەت بەرامبەر ئیسلام و خۆیان بێبەری دەکەن لەو ڕەفتارانە، جا خۆشی لەوەدایە ئەم جۆرە کەسانە هیچ پسپۆری یەکی ئەکادمیشیان لە بوارە جۆراو جۆرەکانی شەریعەت نی یە، بەل□کو هەندێك پزیشك و هەندێك ئەندازیار و هەندێکی تر لە بوارە جیاوازە زانستی یەکانی تر پسپۆڕییان هەیە.

دەی ئیتر بە چ کلۆجێك ڕێگا بە خۆت دەدەیت لە بوارێك قسە بکەیت ڕەخنەی ناماقوڵ بگریت لە کاتێکدا سواری ئەو مەیدانە نیت و تفاقی ئەو شەڕەت پێ نی یە.

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت سەرەڕای بچوکی یەکەی توانیویەتی وەڵامێکی پڕبەپێستی ئەو جۆرە گومانانە بداتەوە سەبارەت بە کۆیلایەتی لە ئیسلامدا، نوسەر (خوای گەورە پاداشتی بداتەوە) بە باشی و بە زمانێکی سادە و دابەشکردنێکی جوان و ڕێك توانیویەتی داڕشتنی بابەتەکانی بکات، تەواوی ئەو پرسیارانەش وەڵام بداتەوە کە لە زهنی خوێنەردایە، هەر لەبەر ئەمە ئێمەش بەپێویستمان زانی وەریبگێڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی، هەرچەندە لەم بوارەدا کەم ئەزمونین، بەڵام گرنگی بابەتەکە وایلێکردین خۆمانی لەقەرە بدەین، لەسەر بنەمای فەرموودەی (مَن لا يَشْكُرِ النَاس لا يَشكُرِ الله) سوپاس و دوعای خەیرمان هەیە بۆ کاك (مەریوان عارف) کە ئەرکی

پیاداچوونەوەکەی لە ئەستۆگرت و ماندوومان کرد، وە سوپاسی کاك (ڕێکار) دەکەین کە دیزاینی کتێبەکەی کرد، لە کۆتاییدا لە دوعای خەیری خۆتان بێبەشمان مەکەن.

وەرگێڕ

٢٧ ذوالقعدة ١٤٣٧

٣١ / ٨ / ٢٠١٦

## پێشەکی نووسەری کتێب

سوپاس بۆ خوا، دابەزێنەری ڕێبازو بەرنامەکان لەبەرژەوەندی بەندە، درودو سڵاو لەسەر ئەو زاتەی کە مرۆڤەکانی لە ستەم و ستەمکاری ڕزگار کرد، وە لەسەر خێزان و خزمان و هاوەڵان و شوێنکەوتووانی کە بنەماکانی یەکتاپەرستی و ئازادی و زانست و عیرفانیان لە زەویدا بڵاو کردەوە، هەروەها لەسەر ئەو کەسەی بە بانگەوازی ئەوان بانگەواز دەکات و ڕێنمونی بە هیدایەتی ئەوان وەردەگرێت بە چاکی تا ڕۆژی دوایی...

**پاشان:**

لە دووتوێی ئەم پەرتوکەمدا (قصة الهداية) چەند وتارێکی بەنرخ ولێکۆڵینەوەیەکی گرنگ هەیە، پێم باش بوو یەك لەدوای یەك پووختەیان بکەم، پاشان بزانم چیان تێدایە، لەسەر ئەو بنەمایە: ئەگەر پێویستی بە بۆ زیادکردن کرد بۆی زیاد بکەم، ئەگەر واشی پێویست کرد لێی لابەرم ئەوە لای بەرم و بیسڕمەوە، دوای تەواوبوون لەم پاك و پوخت کردنە هەمویانم لە (زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی ئیسلامی گرنگ) دا کۆکردەوە، سا بە ڵکو خوێنەرانی ئەم زنجیرەیە بتوانن سوود لەم وتارو لێکۆڵینەوانە وەرگرن و وەڵامێکی دڵنیاکەرەوەیان دەستکەوێت بۆ زۆرێك لەو پرسیارانەی کە پەیوەندی هەیە بە سیستمی ئیسلام و شایەتیدانی دوژمنانەوە.

ASTANA

یەکێك لەو وتارانەی کە پێشکەشم کردوون بریتیە لە وتاری (کۆیلایەتی لە ئیسلامدا)

لە خوا داواکارم رێنمایی گەنجانی موسڵمان بکات بەرەو پێگەشتن و تێگەشتن و رێی راست، بە جۆش و خرۆشی باوەڕدارانەو تێکۆشەرانەوە هانیان بدات بۆ ئەنجامدانی کاری بانگخوازی، هۆکارەکانی سەربەرزی و هێزو هەستانەوە و ڕاپەڕین بۆ ئەم نەتەوەی ئیسلامە سازو ئامادە بکات.... تا بەچاوی خۆمان ئاڵای ئیسلام ببینین دەدرەوشێتەوە... دەوڵەتی ئیسلامی دروست بووەتەوە... کە ئەمەش لای خوای گەورە ئاسانە.

نوســــــەر

## پێشەکی و دەستپێك

دوژمنانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا بە تایبەت (شیوعی یەکان (هەوڵ دەدەن تراوێلکەیەك (سەراب) لە تۆمەت و کەفاوێك لە گومان لەسەر سیستمی ئیسلامی بوروژێنن، ئامانجیان لەمەش چاندنی بێ باوەڕییە لە ناو نەوەی موسڵماناندا، گومان دروستکردنە لای گەنجانی موسڵمان بەرامبەر ئەم سیستمە خوایی یە، پاڵنانی نەتەوەی ئیسلامە بەرەو بێ ڕەوشتی ڕەها و لادانیانە بەرەو ئەو پەڕی بێباوەڕی.

یەکێك لەو بابەتانەی کە دەیوروژێنن لە نێو ناوەندە ڕۆشنبیریەکاندا، ئەوەیە کەوا ئیسلام ڕێگەی داوە بە سیستمی کۆیلایەتی ـ کە بەبۆچونی ئەوان ئەمە کۆت و بەندکردنیی ئازادی مرۆڤەکانە ـ ئەم تۆمەتە درۆیینەیان کردووەتە ئامرازێك بۆ چاندنی تۆوی گومان و تانەدان لە بنەماکانی ئیسلام، بۆ گەشتن بە مەبەست و ئامرازی گڵاویان ـ ئەگەر بتوانن ـ کە بریتی یە لە بڵاوکردنەوەی ئیلحاد و بێباوەڕی لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی و نەوەکانیدا.

کاریگەری ئەم تۆمەتە مەبەستدارو گومانە خراپانە لە ناو گەنجانی موسڵماندا هەستی پێکراوە. هەر بۆیە لەم جۆرە پرسیارانەی خوارەوە ئاڕاستەی زانایان دەکەن:

دەڵێن چۆن ئیسلام کۆیلایەتی حەڵاڵ کردووە و کردوویەتی بەبەشێك لە سیستمەکەی؟ یان ئایا ئیسلام دەیەوێت مرۆڤەکان بەسەر دوو چینی گەورە و کۆیلەدا دابەش بکات؟ یان ئایا خوای گەورە (جل جلالە) کە ڕێزی لە

مرۆڤەکان ناوە چۆن دەیەوێت وەکو کەرەستە لە بازاڕەکاندا بفرۆشرێن؟ جا ئەگەر خوای گەورە (جل جلاله) بەمە ڕازی نییە بۆچی بە دەقێکی ڕوون ئەم کارەی قەدەغە نەکردووە هەروەك چۆن ئارەق و قومار و سووخواردن و داوێن پیسی و شتەکانی تری بە دەقی ڕوون قەدەغە کردووە؟

گەنجانی باوەڕدار باش دەزانن ئیسلام دینی ڕاست و فیترەتە، بەڵام هەروەك چۆن خوای گەورە (جل جلاله) بە ئیبراهیمی پێغەمبەر (علیه السلام) ی فەرموو (قال اولم تومن قال بلى ولكن ليطمئن قلبى) سوورەتی البقره ٢٦٠، واتە ئایا بڕوات نەهێناوە؟ فەرمووی بەڵێ، بەڵام دەمەوێت تەواو دڵنیابم.

بێگومان مرۆڤی ژیرو چاوکراوە ... کاتێك دوور دەکەوێتەوە لە دەمارگیری، خۆی لە دەست هەواو ئارەزووەکانی ڕزگار دەکات، دڵی بۆ ڕاستی و ئاوەزی بۆ بەڵگە و چاوی بۆ ڕووناکی دەکاتەوە... هەر دەبێت لە کۆتاییدا دان بە ڕاستی و ڕاستەقینەدا بنێت، بڕوات بە دەم ئەو سیستەمە خواییەوە کە هیچ شتێکی پوچ و دوور لە ئاوەزی تیادا نیە.

خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت:

(يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَـٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦) سورة المائدة ١٥ـ١٦

واتە: بەدڵنیاییەوە لە لایەن خواوە ڕووناکییەکی ئاشکراتان بۆ هاتووە (کە محمد پێغەمبەرمانە (ﷺ) (هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا

(کە قورئانە)، بێگومان خوای گەورە (جل جلالە) بەو قورئانە هیدایەت و ڕێنمونی ئەو کەسانە دەکات کە شوێن ڕەزامەندی خوای گەورە کەوتون بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسودەیی، لەتاریکیەکان دەریان دەهێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە نێو ڕوناکیەوە، بەفەرمانی خۆی ڕێنمونییان دەکات بۆ سەر ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروستی دینداری و خواناسی.

دوای ئەم پێشەکییە بە پشتیوانی خوای گەورە دەست دەکەم بە ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی کۆیلە، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی دەیانەوێت بزانن، بزانن کە ئیسلام چۆن مامەڵەی کردووە لەگەڵ کۆیلەدا. وە چۆن هۆکاری ئەرێنی (ایجابی) داناوە بۆ ئازادکردنیان، چۆن سیستمی ئەوتۆی داناوە کە لەبناغەوە سەرچاوەکانی کۆیلایەتی وشك دەکات، تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت کە لە دواییدا باسی دەکەین.

بۆ ئەوەی لەهەموو لایەنەکانیەوە باسی کۆیلایەتی بکەم، باش وایە لەم خاڵانە بدوێم:

**خاڵی یەکەم:** کورتەیەکی مێژوویی لەبارەی کۆیلەوە.

**خاڵی دووەم:** هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر کۆیلە.

**خاڵی سێیەم:** هەڵسوکەوتی ئیسلام چۆن بووە بەرامبەر کۆیلە؟

**خاڵی چوارەم:** ئیسلام چۆن کۆیلەی ئازاد کرد؟

**خاڵی پێنجەم:** بۆچی ئیسلام بەیەکجاری کۆیلەیەتی بنەبڕ نەکرد؟

**خاڵی شەشەم:** ئایا لە جیهانی ئەمڕۆدا کۆیلەیەتی بوونی هەیە؟

**خاڵی حەوتەم:** چی هەیە دەربارەی بە کەنیزەك کردنی ئافرەت؟

بەپشتیوانی خوای گەورە لەسەر ئەم حەوت خاڵە بە تێرو تەسەلی قسەدەکەین ...

ASTANA

## کورتەیەکی مێژوویی لەبارەی کۆیلەوە

١ ـ کاتێك ئیسلام هات کۆیلایەتی سیستمێك بوو لە هەموو جیهاندا دان پێدانراو بوو، بەڵکو دراوێکی ئابوری و کۆمەڵایەتی بووەو ئاڵوگۆڕی پێوەکراوە، هیچ کەسێکیش نارەزایی لە دژی دەرنەبڕیوە و بیری لە ئەگەری گۆڕینیشی نەکردووەتەوە.

٢ـ پێش هاتنی ئیسلام سەرچاوەکانی بەکۆیلە کردن لە جیهاندا هەمەچەشن و جۆراو جۆر بوون، لەوانە:

ـ حەزو ئارەزووی بەکۆیلە کردن لە جەنگەکانداو مژینی خوێنی ئەو گەلانەی ژێرکەوتە بوون.

ـ بە کۆیلە کردن بەهۆی هەژاری یان پابەند نەبوونی کەسی قەرزار بە کاتی دانەوە قەرزەکەی.

ـ ئەنجامدانی تاوانی مەترسیداری وەك دزی و کوشتن.

ـ کارکردن لە زەویەك و نیشتەجێبوون تیایدا کە لەلایەن خاوەن زەویەکەوە دەکرا بە کۆیلە.

ـ بەکۆیلە کردن بەهۆی فڕاندن و بەکەنیزەك کردنەوە.

ـ سوکایەتی کردن بە چینی خانەدان و گەورەکان.

ئەم سەرچاوانە و سەرچاوەی هاوشێوەی ئەمانە کە دەکرانە بیانوی وەرگرتنەوەی ئازادی لە مرۆڤ، کردنی بە کۆیلەیەکی سەرشۆڕی بەردەستی خانەدانەکان!!

٣ـ مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلە لە دەوڵەتی ڕۆمان و فارس و هند و چین و یۆنان و جگە لەمانەش مامەڵەیەکی دڕندانەو ئاژەڵیانە بووە، بەشێوەیەك مانای بۆ مرۆڤ بوونیان نەهێشتووەتەوە، شکۆو ڕێزیان پێشێل کراوە، کاری تاقەت پڕوکێنیان پێکراوە، ئەگەرچی کەم تا زۆر لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی هەبووە لەڕادەی دڵڕەقی و ناشرین مامەڵە کردن لە گەڵیاندا.

## وێنەیەك لە هەڵس و كەوتكردن لەگەڵ كۆیلە لە كۆمەڵگای ڕۆمانییدا...

یەكێك لەسەرچاوە سەرەكیەكانی بەكۆیلەكردن لەلایەن ڕۆمانەكانەوە بۆ بەكۆیلە كردنی گەلان، جەنگ كردن بووە، ئەم جەنگانەش لەپێناو بیروبۆچون یان بیروباوەڕێكدا نەبووە، بەڵكو مەبەستی یەكەم و كۆتایی حەزو ئارەزوویان بووە بۆ بەكۆیلەكردنی خەڵكانی تر و بەكارهێنانیان بۆ بەرژەوەندی و سوودی كەسی خۆیان، هەروەك خاوەنی كتێبی (الشبهات) باسی دەكات.

بۆ ئەوەبووە هاوڵاتی ڕۆمانی ژیانێكی خۆش بژی و رابوێرێت، چێژو خۆشی لە گەرماوی گەرم و جل و بەرگی ڕەنگاوڕەنگ ، هەموو جۆرە خواردنێكی بەتام و بەلەزەت وەرگرێت، ڕۆ بچێت لە تام و چێژو خۆشی وەرگرتن حەرامەكانی وەك ئارەق و ئافرەت و سەماو ئاهەنگەكان.

بۆ گەشتن بەو هەموو شتانە دەبوو گەلانی تر بكات بەكۆیلەو بەردەستی خۆی، خوێنیان بمژێت و پیاو و ژنیان بكاتە كۆیلە!!

داگیركارییەكانی ڕۆمانییەكان لەپێناو ئەم جۆرە ئارەزووە خراپانە بووە، كۆیلایەتیش هەر بەرهەمی ئەم داگیركارییە بووە.

ASTANA

**ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین دیمەنەكانی مامەڵەكردنە بەشێوەیەكی دڕندانە لە دەوڵەتی ڕۆمانیدا:**

- لەكاتی كارپێكردنیان لە كێڵگەكاندا دەست و قاچیان بەكۆت و بەندی زۆر گەورە دەبەسترایەوە بۆ ئەوەی توانای هەڵهاتنیان نەبێت.

- خواردنیان پێ نەئەدان ئەوەندە نەبێت كە لەمردن ڕزگاریان بكات و لەژیاندا بمێننەوە بۆ ئەوەی وەك ئاژەڵ سەرشۆڕو ملكەچانە كارەكەی خۆیان ئەنجام بدەن.

- لەكاتی كاركردنیشیاندا بە قامچی بەردەبوونە گیانیان، ئەمە بۆ هیچ مەبەستێك نەبووە ئەوە نەبێت ئارەزوویەكی دوور لە مرۆڤانەیان هەبووە لە ئازاردانی ئەم مرۆڤانەی كە بەئازادی لە دایك بوون.

- شوێنی خەوتنیان زیندانی تاریك و بۆن ناخۆش بووە، كە پڕ بووە لە مشك و مارومێرو، ژمارەیان لە هەر ژوورێكدا دەگەیشتە پەنجا یان زیاترو دەست و قاچیشیان كەلەپچەكراو بووە.

- دوو دوو دەیانخستنە نێو گۆڕەپانەكان بۆ زۆرانبازی بەشمشێرو ڕم... بەچواردەوریشیاندا خانەدانەكان كۆدەبوونەوە بۆئەوەی تەماشای زۆرانبازیی كۆیلەكان بكەن، و بزانن بەبێ سڵكردنەوە لە كوشتنی یەكتر چۆن چۆنی شمشێرو ڕم دەچەقێننە جەستەی یەك، كاتێك یەكێك لە زۆرانبازەكان زۆرانبازەكەی تری دەكوشتو لاشەكەی بەكوژراوی لەسەر خاكی گۆڕەپانەكە فڕێ دەدا!!.[1] خانەدانەكان خۆشییان لەبینینی

---

(١) تێبینی دڕندەیی و نامرۆڤی ئەو خەڵكانە بكە لەو كاتەدا، كە چۆن چێژیان لە كوشتنی خەڵكانی بێتاوان وەرگرتووە، ئەو كۆیلەیەی كە ئیمڕۆ سەركەوتو بووە لە كوشتنی بەرامبەرەكەی سبەی یان دوو سبەی دەبووە قوربانی دەستی كۆیلەیەكی تر، خۆ ئەگەر هەر

ئەم دیمەنانە دەگەیشتە لوتکە، هاواریان ئاسمانی پڕدەکرد و بە چەپڵە پێشوازییان لەم دیمەنانە دەکرد، لە خۆشیدا پڕ بە گەروویان پێدەکەنین، ئاشکرایە لەو سەردەمەدا یاسای ڕۆمانی مافی ڕەهای دەدا بە خاوەنی کۆیلەکان بەکوشتن یان سزادان یان بەکارهێنانی بۆ هەرکارێك، بێ ئەوەی مافی سکاڵای هەبێت، بێ ئەوەی هیچ لایەنێك هەبێت تەماشای ئەو سکاڵایە بکات یان دانی پێدا بنێت، ئەمەش بە هۆی ئەوەی لە دیدی ـ یاسای ڕۆمانیەکانەوە ـ کۆیلە وەك ئاژەڵ یان کەمتر لە ئاژەڵ تەماشا دەکرا، خاوەنەکەی هەرچی بویستایە پێی دەکرد بەبێ ئەوەی لەوبارەیەوە هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو ئەوە کۆیلەکە بوو کە ڕووبەڕوی لێپرسینەوە دەکرایەوە!!

ئەمە گوزەرێکی خێرابوو لەبارەی دۆخ و گوزەرانی کۆیلەوە لەپێش ئیسلام، لەمەودوا ئەو جیاوازیە گەورەیەت بۆ دەردەکەوێت کە هەیە لەنێوان ئەم مامەڵە دڕندە دڵڕەقانەو ئەو هەڵسوکەوتە پڕ سۆزو میهرەبانیەی کە شەریعەتی ئیسلام فەرمانی پێ کردووە.

وەك دەڵێن (بە پێچەوانەکەیدا شتەکان جیا دەکرێنەوە...)

---

چانسی مانەوەی ببوایە ئەوا بەدەستی خانەدانەکان دەکوژرا، چونکە نابێت کەسانێك هەبێت ئازایەتیەکەیان بەرادەیەك بێت هاوتەریب بی لەگەڵ خانەدانەکان، مانەوەی یەکجاریی هەر دەبێت بۆ خانەدان بێت و مردن و سەرشۆڕیش بۆ کۆیلەکان ..)وەرگێڕ)

## هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر کۆیلە

وەك کەمێك پێش ئێستا باسمان کرد، کاتێك ئیسلام هات کۆیلەیەتی سیستمێکی جیهانی بوو، لەلایەن سەرجەم وڵاتانی جیهان و گەلەکانیانەوە دانی پێدا نرابوو، نەك هەر ئەوە بگرە کۆیلەیەتی دراوێکی بازرگانی گرنگیش بووە، پێویستییەکی کۆمەڵایەتی ئاڵوگۆڕ پێکراو بوو، نەکەس ناڕازی بووە و نەکەسیش بیری لە ئەگەری گۆڕینی ئەم سیستمە کردووەتەوە...

هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە پێش هاتنی ئیسلام سەرچاوەی کۆیلایەتی لە وڵاتانی جیهاندا جۆراوجۆر و هەمەچەشنە بوون، هۆکاری زۆری هەبووە و ئامانج و مەبەستی زۆری لەپشتەوە بووە!!

ASTANA

## ئەی ئیسلام چی کردووە بۆ کۆیلە؟؟

ئیسلام هات هەموو سەرچاوە کۆنەکانی بە کۆیلەکردنی وشك کرد، جگە لە یەك سەرچاوە نەبێت کە لەتوانایدا نەبووە بنەبڕی بکات ـ بەو پێیەی لەو کاتەدا ئەو شێوازە سیستمێکی جیهانی باوبوو بۆ بە کۆیلە کردن لە جەنگەکاندا ـ کە ئەویش کۆیلەکردن بوو لە جەنگدا.

**ئێستاش هەندێك بە دوورو درێژی باسی دەکەین:**

داب و نەریتی بەربڵاوی ئەوکات ئەوە بووە کەسی دیل یان دەکوژرا یان بە کۆیلە دەکرا، هەروەك خاوەنی کتێبی (الشبهات) دەڵێت، ئەم نەریتەش زۆر کۆن بووەو چووەتە ناو تاریکاییەکانی مێژووەوە، وەختە بچێتەوە سەر یەکەم مرۆڤ، بەڵام لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا نوساوە بە مرۆڤایەتی یەوە و لەگەڵیدا هاتووە.

کاتێك ئیسلام هات مرۆڤەکان لەم بارودۆخەدا دەژیان، جەنگ لە نێو ئیسلام و دوژمنەکانیان بەرپابوو، دیلی موسوڵمان دەکرانە کۆیلە لای دوژمنانی ئیسلام، هەموو ئازادییەکیان لێ زەوت دەکرا و لێیان دەسەنرایەوە، لەو سەردەمەدا هەموو ئەو هەڵس و کەوتە ستەمکار و دڕندانەیەی لەگەڵ کۆیلەکاندا دەکرا لەگەڵ ئەمانیش دەکرا!!

لە بارودۆخێکی ئاوادا ئیسلام نەی دەتوانی هەستێت بە ئازادکردنی ئەو دیلانەی دوژمنانی ئیسلام کە لە جەنگەکاندا بە دیل دەگیران، چونکە ئەوە بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دروست هەژمار ناکرێت

تۆ بێیت بە ئازادکردنی دیلەکانیان هانی دوژمنانت بدەیت لەسەر خۆت، لەکاتێکدا کە کەس و کارو هۆزو شوێنکەوتەی دینەکەی تۆ لای ئەوان دوچاری ستەم و زۆرو ئازاردان و بە کۆیلەکردن ببنەوە.

لێرەدا هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ دوژمن بەو جۆرەی ئەو مامەڵەت لەگەڵدا دەکات باشترین و دادگەرانە ترین یاسایە کە بتوانیت بەکاری بهێنیت بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنان، بەڵکو تاکە یاساشە.

لە دیدی ئیسلامەوە ئەو جەنگەی رێگە دەدات بە کۆیلەکردنی دیل بریتیە لەو جەنگەی کە بە جەنگێکی ڕەوا ناو دەبرێت، جەنگی ڕەواش ئەو جەنگەیە کە ئەم مەرجە سەرەکیانەی تێدایە:

١- دەبێت ئەم جەنگە لە پێناو خوادا بێت و بۆ بەدی هێنانی ئەم وتەیەی خودای میهرەبان بێت (جل جلاله) ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ النساء :٧٦

واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە لە پێناو خودا دەجەنگن.

واتای ئەمەش ئەوەیە کە جەنگ کردن لە ئیسلامدا نە بەهۆی حەز و ئارەزووی داگیرکارییەوەیە، نە بە نیازی بەدەستهێنانی سەربەرزی و ناوبانگە، نە بەنیازی داگیرکاری ستەمکارییە... بەڵکو تەنها و تەنها بۆ ڕێنمونی مرۆڤەکان و بڵاوکردنەوەی چاکسازی و دەرکردنی بەندەیە لە بەندایەتی کردنی مرۆڤ بۆ بەندایەتیکردنی خودا، وە لە تەنگی دونیا بۆ فراوانی ئیسلام، وە لە ستەمی دینەکان بۆ دادگەری ئیسلام...

هیچ کوشتارێکیش لە پێناو خودادا نابێت ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا نەبێت:

ASTANA

أ- دوور خستنەوەی دوژمنان لە موسڵمانان ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠﴾ البقرة :١٩٠

واتە: جەنگ بکەن لەڕێی خوادا لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵ دەکەن وە دەست درێژی مەکەن بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت.

ب - تێکشکانی هێزە لەڕێ دەرچووەکان کە بە زۆرو توندوتیژی خەڵك لە ئایینەکەیان وەردەگێڕن ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ الانفال: ٣٩

واتە: (باوەڕداران) جەنگ بکەن لەگەڵ بێباوەڕاندا هەتا ئاژاوە (بێباوەڕی و بت پەرستی ) نامێنێت.

ج - بۆ لابردنی تاغوتان و هێزە ستەمکارە گومڕاکەی، کە دێتە سەر ڕێگای بانگەوازی ئیسلامی، ڕێگری دەکات لە گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامی بە گەلان ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ٧٦﴾ النساء:٧٦

واتە: وە ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناو ناڕەوا (یان شەیتان) دا دەجەنگن کەواتە شەڕ بکەن لەگەڵ دۆستەکانی شەیتاندا بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە.

د - لە پێناو پەیمان شکێنی دوای پەیمان و بەڵێن دان ﴿وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴾. التوبة:١٢

واتە: بەڵام ئەگەر سوێند و پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە پاش بەستنی پەیمانەکەیان و تەشەر و تانەیان دا لە ئایینەکەتان، ئەوە بجەنگن لە دژی پێشەوایانی بێباوەڕی، بەڕاستی ئەوانە هیچ جۆرە پەیمانێکیان نیە بەڵکو کۆتایی بێنن (بەبێ باوەڕی).

٢- دروست نییە بۆ موسلمانان جەنگ بەرپا بکەن دژی هیچ نەتەوەیەك پێش ئەوەی ئاگاداریان بکەنەوە یاخود ئەم سێ پێشنیارە بخەنە بەردەستیان:

١ - یان موسوڵمان بوون.
٢- یان سەرانە دان.
٣ - یان جەنگ کردن.

- ئەگەر بەخۆشی و بێ زۆر لێکردن بەئیسلام رازی بوون، ڕێگای هیدایەتیان دۆزییەوە، ئەوە ئیتر نە جەنگ، نە مل ملانێ، نە دوژمنایەتی نا مێنێت... بەڵکو حاڵیان وەك حاڵی موسڵمانانی لێ دێت، چی لەسەر موسڵمانە لەسەر ئەوانیشە، چی بۆ موسڵمانە بۆ ئەوانیشە، هیچ کەس پلەوپایەی لەوی تر بەرزتر نییە تەنها بە لەخواترسان و کردەوەی چاك نەبێت.[١]

خۆ ئەگەر ئیسلامیان وەرنەگرت و ڕەتیان کردەوەو ویستیان لە ژێر سیبەری سیستمی ئیسلامیدا لەسەر بیروباوەڕی خۆیان بمێننەوە، ئەوە ئازادن و کەس ناتوانێت زۆریان لێ بکات یان فشاریان لێ

(١) ئەگەر مسوڵمانان نەتوانن پارێزگاریان لێ بکەن ئەوە دەبێت ئەو سەرانەی وەریان گرتووە بیگێڕنەوە بۆیان، هەروەك ابو عبیدە کردی لەگەڵ دانیشتوانی چواردەوری حیرە.

بکات بۆ گۆڕینی ئایینەکەیان... بەو مەرجەی بەرامبەر پاراستنیان لەلایەن دەسەڵاتی ئیسلامەوە بڕێك پارە بدەن.

ئەم سەرپشك کردنە لەنێوان موسڵمان بوون یان مانەوە و دانی سەرانە و پارێزگاری کردنی بیروباوەڕی خۆیان لە ئایەتی: (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ) البقره:٢٥٦ جەختی لێ کراوەتەوە.

واتە: بە هیچ جۆرێك زۆرلێکردن لە دیندا نییە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی ڕێنموونی و شارەزایی جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەر لێشێواوی.

مانەوەی جولەکەو گاورەکان لەسەر دینی خۆیان لە جیهانی ئیسلامیدا تائیستا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە، ئەوەی جێگەی گفتوگۆکردن نییە ئەوەیە کەوا ئیسلام لەڕێگای بەکارهێنانی زۆرو شمشێرەوە زۆری لە کەس نەکردووە شوێنی بکەوێت.

(السیرت. ارنۆلد) کە گاورێکی ئەوروپی بە ویژدانە، لە پەڕاوەکەیدا بەناوی (الدعوة الى الاسلام) لەم بارەیەوە شایەتی داوە.

خۆ ئەگەر نە ئامادەبوون موسوڵمان ببن و نە ئامادەش بوون سەرانە بدەن، کەواتە ئەوانە لاسارو کەللە ڕەقن، بەڵکو سوریشن لەسەر ئەوەی ببنە کۆسپ لەبەردەم ئەوەی بانگەوازی ئیسلامی بگات بە گەلانی ژێر دەستیان...

لێرەدا ڕۆڵی کوشتار دێتە پێشەوە بۆلابردنیان لەسەر ڕێگاکە... بەڵام جەنگیان لەگەڵ بەرپا ناکرێت تاوەکو ئاگادار نەکرێنەوە، بۆ

ئەوەی چانسی کۆتایی بخرێتە بەردەمیان لەنێوان دانی سەرانە یان جەنگ کردن... ئەمەش لەپێناو ڕێگری کردن لە ڕژانی خوێندایە.

٣ـ لە کاتی جەنگەکەشدا هەرکات لەلایەن دوژمنانەوە داوای ئاشتی کرا دەبێت وەڵامی موسڵمان ئەرێنی بێت، هەروەك خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ الانفال: ٦١

واتە: وە ئەگەر ئەوانە مەیلی ئاشتیان هەبوو تۆش (ئەی موحەمەد (ﷺ)) مەیلی ئەوە بکەو پشت بە خوا ببەستە.

بەو مەرجەی ئەم ئاشتەواییە ئاشتەواییەکی هەرزان فرۆش نەبێت کە بەرژەوەندی دوژمن و زیانی موسوڵمانانی تێدابێت.

ئەمانە گرنگترین خەسڵەتەکانی ڕەوایەتی جەنگ و دیارترین مەرج و ئامانجەکانی بوون لە دیدی ئیسلامەوە.

کاربەدەستانی موسڵمانان ئەگەر لەگەڵ دوژمنانی دیندا جەنگێکیان بەرپاکرد - بەو خەسڵەتانەی کە لەپێشەوە باسیان کرا - و لێیان بە دیل گرتن، ئەوە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا لەنێوان ئەم چوار شتەدا سەرپشك دەکرێن:

١ـ ئازاد کردنیان بەبێ بەرامبەر، ئەمەش منەتێکە بەسەریانەوە.

٢ـ ئازادکردنیان بە بەرامبەر، کە ئەمەش ئازاد کردنە بە فیدیە .

٣ـ کوشتن.

٤ـ بە کۆیلە بکرێت.

هەرچی ئازادكردنی كۆیلەیە بە خۆڕایی و منەت خستنەسەر یان بە فیدیەو بریتی (المن والفداء) ئەوە خوای گەورە دەربارەی دەفەرمویت: (فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا) محمد: ٤

واتە: جا دواتر یان بە منەت و چاكە (بەرەڵایان كەن) یان بە فیدیە و بریتی هەتا جەنگ چەك (بەبێ باوەڕان) دادەنێ ( یاخود تاوەكو جەنگ كۆتایی دێت بە نەمانی بت پەرستان).

دەربارەی كوشتن دەفەرمویت: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ) الانفال: ٦٧

واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نیە كە دیلی (لە دوژمنان) هەبێت هەتا كوشتاری زۆریان لێنەكات لە زەویدا.

دەربارەی بە كۆیلەكردنیش لە سوننەتی ڕاست و دروستی پێغەمبەر (ﷺ)دا هاتووە كە خودی خۆی لە هەندێك لە جەنگەكاندا دیلی كردووە بە كۆیلە، هەروەك بە كۆیلە كردنی ژن و منداڵی جولەكەكانی بەنی قورەیزە.

ئا لێرەشەوە، پێشەوای موسڵمانان مافی ڕەهای هەیە لە هەڵبژاردنی هەریەكێك لەو چوار خاڵەی سەرەوە.

هەڵبژاردنەكەش بەپێی بەرژەوەندی مسوڵمانانە لەڕووی بەهێزی و لاوازیانەوە... هەروەها دەشتوانێت تەماشای مامەڵەی دوژمنان بكات لەگەڵ دیلی موسڵمانان، بۆئەوەی ئەمیش بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ دیلەكانی ئەواندا بكات، بەپێی بنەما سەرەكیەكەی (مامەڵەكردنی هاوشێوە)، كە قورئانی پیرۆز دایناوە (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا) الشوری: ٤٠

ASTANA

واتە: لە تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەكە بە وێنەی خۆی.

هەروەها گەورەی موسڵمانان دەتوانێت تەماشای گیانی لێبوردەیی ئیسلام بكات لە هەڵسوكەوتی لەگەڵ دیلەكان، لەسەر بنەمای ئازادكردنیان یان وەرگرتنی فیدیە لە بریتیان، بۆ ئەوەی بەم رەفتارەی وانەیەكی مەزنی لێبوردەیی لەكاتی دەسەڵاتدا نیشانی دوژمنان بدات، هەروەك چۆن سوڵتان صلاح الدینی ئەیوبی بەرامبەر دیلی خاچپەرستەكان ئەم كارەی كرد، كاتێك لە جەنگی یەكلاكەرەوەی (حطين)دا سەركەوت بەسەریاندا و هەندێكیانی ئازادكردو فدیەی لە ئەوانی تریان وەرگرت، ئەگەر بیویستایە بیان كوژێت ئەوە دادگەری ئەنجام دەدا لەسەر بنەمای مامەڵەكردنی هاوشێوە، لەبەر ئەوەی خاچ پەرستەكان لە جەنگی یەكەمی خاچ پەرستەكاندا لەیەك ڕۆژدا حەفتا هەزار یان زیاتریان لەموسڵمانان كوشت. ڕەحمەتی خودا لەو كەسەی كە فەرمویەتی:

ملكنا فكان العدل منا سجــية
فلما ملكتم سال بالدم ابطــخ
و حللتم قتل الاساري و طــالما
غدونا علي الاسري نمن ونصفح
فحسبكم هـــذا التفوت بيننا
وكل انـــاء بالذي فيه ينضــح

واتە: دەسەڵاتمان وەرگرت دادپەروەری سیفەتیك بوو تیاماندا
كاتێك ئێوە دەسەڵاتتان وەرگرت خوێن لە (ابطح)[1] رۆیشت
كوشتنی دیلتان حەڵال كرد لە كاتێكدا

---

(١) شوێنێكە كە وورده بەردی زۆر بێت، یان دۆڵێكە لە مەككە ( وەرگێر)

ئێمە دەچووینە سەر دیلەکان ئازدمان دەکردن و لێیان دەبوراین.
ئەگەر هەر ئەم جیاوازییەهەبێت لە نێوانماندا بەسە
هەر دەفرێك بەوەی تیایدایە لەسەری دەڕژێت.

لەمەی کە خستمانە ڕوو دەردەکەوێت کە پێشەوای موسوڵمانان دەسەڵات و ئازادی تەواوی هەیە لەوەدا کە چۆنی بەباش دەزانێت ئاوا مامەڵە بکات لەگەڵ دیلی دوژمناندا، واتە ئازادکردن بەخۆڕایی یان وەرگرتنی فیدیە و بریتی یان کوشتن یان کۆیلەکردن. جا ئەگەر هاتوو پێشەوای موسوڵمانان بەوجۆرەی بەباش دەزانی لە ئێستادا پەنا نەباتە بەر کۆیلەکردنی دیل بەهۆی ئەوەی کە جیهان ڕێك کەوتوون لەسەر قەدەغەکردنی کۆیلە، یاخود لەو ڕوانگەیەوە کە یەکێك لە ئامانجە گشتیەکانی ئیسلام بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلە، یاخود لە ڕوانگەی گیانی لێ بوردنی قورئانیی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکان لەسەر بنەمای ئازادکردن بە خۆڕایی یان وەرگرتنی فیدیە و بریتی ... ئەوە تواناو دەسەڵاتی ئەوەی هەیە جگە لە بەکۆیلەکردن یەکێکی تر لەو سێ ڕێگایە هەڵ بژێرێت کە لەبەردەمیدایە، بۆ ئەوەی دوای کۆتایی هاتنی جەنگ جێبەجێی بکات بەسەر ئەو کەسانەی بەدیلی دەکەونە دەستی موسوڵمانان.

ئەمەش ئەو کارە بوو کە خەلیفەی عوسمانی (محمد فاتح) کردی کاتێك لە پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتیدا لەگەڵ دەوڵەتەکاندا ڕێکەوت لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بە کۆیلەکردنی دیل لە جەنگەکاندا، ئیتر لەو کاتەوە تا ئێستا دەوڵەتەکان لەسەر ئەم پەیماننامە دەڕۆن و کاری پێ دەکەن و بەکۆیلەکردن لەجەنگەکاندا قەدەغەکرا!! ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە کۆیلایەتی بەیەکجاری هەڵوەشاوەتەوە و لەڕوی

یاساییشەوە کۆتایی پێ هاتووە - هەروەك هەندێك وا گومان دەبەن - بەڵکو واتای ئەوەیە کە پێشەوای مسوڵمانان لەبەر هۆکارێکی شەرعی دەسەڵاتی خۆی بەکارهێناوە لە هەڵبژاردنی ئازادکردن بە منەت یان بە فیدیە بەسەر بە کۆیلە کردنی دیلی جەنگدا.

لەوانەیە ڕۆژێك بێتە پێشەوە سیستمە کۆمەڵایەتەکانی جیهان ڕێگە بە دووبارە کۆیلە کردنی دیلی جەنگ بداتەوە، نابێت ئیسلامیش لەم حاڵەتەدا دەست بەسراو بێت بەرامبەر ئەم ڕووداوە تازەیەو بێگومان دەبێت (مامەڵەکردنی هاوشێوە) پەیڕەو بکات.

## پوختەی قسە:

ئیسلام هەموو سەرچاوە کۆنەکانی کۆیلایەتی وشك کرد، جگە لە یەك سەرچاوە نەبێت، ئەویش کۆیلەکردنی دیلەکانی جەنگە لە شەڕێکی ڕەواو شەرعیدا، ئەمەش بەو مەرجەی پێشەوای موسوڵمانان بەرژەوەندییەکی بینی لەو بەکۆیلە کردنەدا.

ئەگەر جیهان ڕێك بکەون لەسەر حەرام کردنی بە کۆیلەکردن لە جەنگدا هەروەك سوڵتانی عوسمانی محمد الفاتح (خوا لێی خۆش بێت) کردی، ئەوە پێشەوای موسوڵمانانیش دەتوانێت لەبری بەکۆیلەکردن ئازادکردنی بە منەت یان ئازادکردن بەدانی فیدیە بەکار بهێنێت، بەو پێیەی ئیسلام پێشەوای موسڵمانانی سەرپشك کردووە لەنێوان (٤) کاردا: ئازادکردن بە خۆڕایی یان بە فیدیە و بریتی یان کوشتن یان بەکۆیلە کردن.

لێرەشدا و لەژێر ڕۆشنایی ئەو بەرژەوەندیەی کە خەیری ئیسلام و موسڵمانان و مرۆڤایەتی بە گشتی تێدابێت یەکێك لەو چوارە هەڵدەبژێرێت... خواش خۆی زاناترە.

## ئیسلام چۆن مامەڵەی لەگەڵ کۆیلەدا کردووە؟

هیچ سیستمێکی کۆمەڵایەتی نییە لەجیهاندا وەك ئیسلام مامەڵەیەکی مرۆڤانەی بەڕێزی لەگەڵ کۆیلەدا کردبێت.

دەتوانین ئەم مامەڵەیە بەرامبەر کۆیلە لە سیستمی ئیسلامیدا کورت بکەینەوە بۆ سێ بەندی بنەڕەتی:

**بەندی یەکەم:** تەماشاکردنی کۆیلە وەك کائینێك کە مافی ڕێزو ژیانی هەیە.

**بەندی دووەم:** یەکسانکردنی مرۆڤ لە ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا لەڕوی ئەرك و مافەوە.

**بەندی سێیەم:** مامەڵەکردنێکی مرۆڤانەی تایبەت لەگەڵ کۆیلە، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە هەست بە مرۆڤایەتی خۆی بکات لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکانی تردا.

هەرچی ئەو لایەنەیانە کە پەیوەستە بە دانانی کۆیلە وەك کائینێك کە مافی ڕێزگرتن و ژیانی هەیە:

ئەوە ئیسلام کاتێك هات، هات بۆ ئەوەی پێیان بڵێت مرۆڤەکان بەجیاوازی ڕەگەزو ڕەنگ و ئاستی بژێوی و بارودۆخیانەوە هەموویان یەك بنەچەو یەك چارەنوسیان هەیە.

ASTANA

هات بۆئەوەی بڵێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾ الحجرات : ١٣

واتە: ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێر و مێیەك و كردومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەكتری بناسن، بەراستی بەڕێزترینتان لای خودا پارێزگارترینتانە.

ئیسلام هات بۆ دەرخستنی ئەوەی كە لە سەر زمانی خاوەن پەیامەكەوە محمد كوڕی عبدالله (ﷺ) ڕونی بكاتەوە كە خانەدان فەزلی نییە بەسەر كۆیلەدا، سپی فەزلی نیە بەسەر ڕەش پێستدا، عەرەب فەزلی نیە بەسەر كەسانێكدا كە عەرەب نین، تەنها بە لە خواترسان نەبێت، ڕیوایەتی مسلم و طبری یە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەحەجی ماڵئاواییدا لە (مینا)[١] بنەماكانی مافی مرۆڤی چەسپاندو فەرمووی:

(أنتُم بَنو ءادَم وَ ءادَمُ مِنْ تُرَاب، وَ إنَهُ لا فَضلَ لِعَرَبِّي عَلى أَعْجَمِي، وَ لا لأعجَمِي عَلى عربي، وَلا أسوَدَ عَلى أَحمَر وَلا اَحمَرَ عَلى أسوَد إلا بِالتَقْوى)[٢] واتە ئێوە نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە، هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان عەرەب و غەیرە عەربیێكدا، لە نێوان سورو ڕەشێكدا مەگەر بە لە خواترسان و پارێزگاری كردن نەبێت.

لەم دەقانەوە روون دەبێتەوە كە كۆیلە لە سیستمی ئیسلامیدا بونەوەرێكی زیندووەو وەك هەر دروستكراوێكی تر مافی ڕێزگرتن و ژیانی هەیە، ئەو و هیچ مرۆڤێكی تر جیاوازیان نییە، ڕەگەزی

---

(١) ئەو شوێنەیە كە حاجیان تیایدا دەمێننەوە پێش عەرەفە.
(٢) سەرچاوەی حەدیس

ASTANA

هەرچەند بەرزبێت و ناوو ناوبانگی هەرچەند گەورەبێ، تەنها بە لە خواترسان و کردەوەی چاك نەبێت.

هەرچی ئەو لایەنەشە کە پەیوەستە بە یەکسانی کۆیلە لەگەڵ ڕەگەزی مرۆڤدا لە ئەرك و مافدا:

ئەوە ئاینی ئیسلام لە نێوان کۆیلەو هەر مرۆڤێکی تردا لە ئەرك و مافدا یەکسانی کردوون، لە هەندێ حاڵەتی تایبەتدا نەبێت کە ئیسلام کۆیلەی بەخشیوە لێیان بەهۆی ئەوەی کە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ئەو بەرپرسیارێتیانەی کە پێی سپێردراوە، وەك بەخشینی لە نوێژی هەینی و فەریزەی حەج.

لەسەر بنەمای بڕیاردانی ئەو بنەمای یەکسانی یەی کە ئیسلام بەخشیویەتی بە کۆیلە:

ئیسلام دانی ناوە بەوەدا کە کۆیلەکان لە سزاو سنورەکاندا لەگەڵ کەسانی ئازاددا یەکسان بن:

بوخاری و موسلیم و ئەبوداودو ترمزی لە پێغەمبەری خوداوە گێڕاویانەتەوە کە (من قتل عبده قتلناه، ومن جدع عبده جدعناه[1] ومن خصي عبده خصيناه)

واتە: هەرکەسێك کۆیلەکەی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسێك هەتکی کۆیلەکەی بکات هەتکی دەکەینەوە، هەرکەس کۆیلەکەی بخەسێنێت دەی خەسێنینەوە.

---

(١) الجدع: لوت بڕین یان گوێ بڕین، دەست بڕین، لێو بڕینیش دەگرێتەوە

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئیسلام سزاو تۆڵەی لەسەر کۆیلەکان سوك کردووە و بە نیوەی سزای کەسانی ئازادی داناوە، لەبەر هەندێك هۆکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی.

ئیسلام دانی ناوە بە بنەمای برایەتی موسوڵمانێتی بۆ کۆیلەکان:

لە دیارترین وێنەو ماناکانیدا، ئەوان لەگەڵ خانەدانەکاندا خۆشەویستی یەکترو هاوکاری یەکترین، پێشەوا بوخاری لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە دەرفەرموێت: (اخوانکم خولکم ملکهم الله ایاکم، فمن کان اخوه تحت یده فلیطعمه مما یطعم ولیلبسه مما یلبس، ولاتکلفوهم من الاعمال ما لا یطیقون، فان کلفتوهم فاعینوهم).

واتە: براکانتان بەندەکانتانن خوای گەورەش خستونیەتیە ژێر دەستی ئێوەوە، جا هەرکەسێك براکەی لەژێر دەستیایەتی با لەو خۆراکەی بداتێ کە خۆی دەیخوات لەو پۆشاکەی لەبەربکات کە خۆی دەیپۆشێت و کارێکیان پێ مەسپێرن کە لەتوانایاندا نییە ئەنجامی بدەن، ئەگەر کارێکتان پێ سپاردن هاوکاریان بکەن و یارمەتیان بدەن.

## ئیسلام دانی ناوە بە بنەمای یەکسانیی لە پاداشتی قیامەتیدا بۆ کۆیلەکان

کۆیلەکان وەك کەسانی ئازاد وان لە بەدەستهێنانی نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدا، ئەگەر هاتوو لەسەر ڕێی ڕاست دامەزراو بوون و کردەوەی چاکیان ئەنجام دا... خودای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت:
(وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ) غافر: ٤٠

واتە: هەر کەسێکیش چاکەی کردبێت ئافرەت بێت یان پیاو و باوەڕداربێت، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و لەوێدا بێ هەژمار ڕزق و ڕۆزیان پێدەدرێ.

دەستەواژەی ئایەتەکەش گشتی یە بۆ هەموو نێر و مێیەك، جا کۆیلەبن یان ئازاد، هەژاربن یان دەوڵەمەند.

ئیسلام بڕیاری بنەمای کەرامەتی مرۆڤایەتی داوە بۆ کۆیلە:

کۆیلە وەك ئازاد وایە لە ئەسڵی مرۆڤایەتیدا، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ) سورة النساء: ٢٥

واتە: وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هەژاری ئافرەتانی ئازادی ئیماندار مارە بکات ئەوە دەتوانن ئافرەتانی کەنیزەکی باوەڕدار مارە بکەن، وە خوا زاناترە بە باوەڕەکەتان هەندێکتان لە هەندێکی ترتانن (هەموتان نەوەی ئادەمن).

ئەم ئایەتە لەبارەی دروستی مارەکردنی ئافرەتانی کەنیزەکی موسوڵمان بۆ ئەوکەسانەی کە ناتوانن ئافرەتانی داوێن پاکی ئازاد مارە بکەن هاتۆتە خوارەوە، ئایەتەکە بڕیاری لەسەر ئەوە داوە کە لەڕووی بنەچەی دروستبوون و چارەنوسیانەوە هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان ئافرەتانی ئازاد و کەنیزەك و ئەو کەسانەی دەیان هێنن.

ئەم بنەمایانەی ئیسلام بڕیاری لەسەر داون بۆ کۆیلە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر بڕیاردانی ئیسلام لەبارەی بیرۆکەی یەکسانی مرۆڤایەتی تەواو لە نێوان کۆیلە و گەورەکەیاندا، کە ئەمە لەڕاستیدا بنەمایەکی نەمرەو بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی و بەئێستاشەوە هیچ یاسایەکی مرۆڤکرد و سیستمێکی زەمینی نەیتوانیوە پێی بگات... کە ئەمەش دووپات کردنەوەی ئەوەیە کە ئیسلام ئاینی زەمینەبینی و ژیانە هەتا ئەو ڕۆژەی خودا زەوی بە ئاوەدانی دەهێڵێتەوە.

# دەربارەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کۆیلە بەشێوەیەکی مرۆڤانە

ئیسلام لە پرۆگرامە کردەییەکانی و راسپاردەکانیدا داوای کردووە بەجۆرێك مامەڵە بکرێت لەگەڵ کۆیلەدا کە بەدرێژایی مێژو نەوە یەك لەدوای یەکەکانی موسوڵمانان شانازی پێوە بکەن.

یەکێك لەو ڕاسپاردانەش ئەوەیە کە خاوەن کۆیلەکە چی دەخوات دەبێت لەو خواردنەش بدات بە کۆیلەکە و ئەو جل و بەرگانەی لەبەری دەکات دەبێت لەو جل و بەرگانەش بۆ کۆیلەکەی دابین بکات، کەمێك پێش ئێستا باسی فەرمودەیەکمان کرد کە دەفەرموێت: (فمن كان اخوه تحت يده فليطعمه مما يطعم، وليلبسه مما يلبس).

یەکێکی تر لەو راسپاردانە ئەوەیە کە نابێت ئەو کارانەی پێ بکات کە لەتوانای ئەودا نییە، بەهەمان شێوە پێشتر باسی ئەم فەرموودەیەمان کرد: (ولا تكلفوهم من الاعمال مالا يطيقونه فان كلفتموهم فاعينوهم)

راسپاردەیەکی تریان ئەوەیە کە دەبێت بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکرێت لەگەڵ کۆیلەدا کە هەست بکات لەناو خزم و کەسوکاری خۆیدایە، بەبەڵگەی ئەو فەرموودە دروستەی کە دەفەرموێت: (لايقل أحدكم: هذا عبدي و هذه امتي بل يقل فتاي وفتاتي) واتە بە ژێر دەستەکانتان مەڵێن ئەمە کۆیلەمە یان کەنیزەکمە بەڵکو بڵێن ئەمە کوڕمە یان کچمە.

یەکێك لە ڕاسپاردەکانی تر ئەوەیە کە هەرکەس بیەوێت دەتوانێت هاوسەرگیری بکات لەگەڵ کەنیزەکدا، هەروەك خودای گەورە (جل جلاله) دەفەرمویێت ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ النساء :٢٥

واتە: وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هەژاری ئافرەتانی ئازادی ئیماندار مارە بکات ئەوە کەنیزەکەکانتان مارە بکەن، وە خوا زاناترە بە باوەڕەکەتان...... لەبەر ئەوە مارەیان بکەن بەڕەزامەندی خاوەنەکانیان و مارەییەکەیان پێبدەن.

یەکێکی تر لە ڕاسپاردەکان ئەوەیە کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت هەروەك چۆن لەگەڵ دایك و باوك و خزمە نزیکەکان هەڵسوکەوت دەکەن، هەروەك خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ٣٦﴾ النساء :٣٦

واتە: هەروەها لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن وە لەگەڵ خزم ونزیکانو هەتیوانو هەژارانو هاوسێی خزم و هاوسێی بێگانە یان دوورو، هاوڕێی هەمیشەیی یان هاوڕێی سەفەر و ڕێبوار و ئەوانەی بوون بە موڵکتان (چاك بن لەگەڵیاندا) بەڕاستی خوا ئەو کەسەی خۆش ناوێت کە خۆبەزل زان و شانازیکەر بێت.

یەکێکی تر لە ڕاسپاردەو بەرنامەکان بریتیە لە دانانی پلانێکی کرداری بۆ ئازاد کردنی کۆیلە. کە بەویستی خوا دواتر بەدووررو درێژی لەبەشێکی سەربەخۆدا ئەم خاڵەیان ڕوون دەکەینەوە.

مامەڵەکردنی بەرزو جوانی شەریعەتی ئیسلام لەگەڵ کۆیلەدا گەشتە ڕادەیەك کە تەنها بەوەندەی گەورەکە لە کۆیلەکەی بدات بەبێ ئەوەی بیانویەکی شەرعی هەبێت - وەك دواتر باسی دەکەین - دەبێت ئازادی بکات.

نەك هەر ئەوە بەڵکو ئیسلام لە هەڵسوکەوت کردنی باشی لەگەڵ کۆیلەو گێڕانەوەی مانای مرۆڤایەتی بۆی گەشتە پلەیەکی جوان و سەرسوڕهێنەر لە بواری کرداریدا.

لەخوارەوە هەندێك لەو نمونانەتان بۆ باس دەکەین کە محمد قطب[(١)] لە پەڕاوی (الشبهات)دا باسی دەکات:

. پێغەمبەری خوا (ﷺ) برایەتی خستە نێوان هەندێك لە کۆیلە و گەورەکانی قوڕەیش وەك:

برایەتی خستە نێوان بیلالی حەبەشی و خالید کوڕی ڕوەیحە خەسعەمی...

برایەتی خستە نێوان زەیدی کوڕی حاریسەو حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی.

برایەتی خستە نێوان زەید و ئەبوبکری صدیق ... ڕەزای خودا لە هەموویان بێت.

---

(١) یەکیکە لە بیریارە ئیسلامیەکان و خەلکی میسرەو برای شەهید سید قطبە

ئەم برایەتیە پەیوەندیەکی ڕاستەقینە بوو، بەجۆرێك کە یەکسان بوو بە پەیوەندی لەسەر بنەمای خوێن و خزمایەتی پشتاو پشت، تەنانەت دەگاتە ئاستی بەشداریکردن لەمیراتدا..

پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەوەشەوە نەوەستا...

بەڵکو زەینەبی کچی جەحشی کچە پوری خۆیی مارە کرد لە کۆیلەکەی خۆی کە زەیدی کوڕی حارسە بوو.

هاوسەرگیریش مەسەلەیەکی زۆرهەستیارە بەتایبەتی لای ئافرەت، چونکە ئافرەت بە هاوسەرگیریەك ڕازی دەبێت کە کەسەکە ئاستی لەخۆی بەرزتربیت، بەڵام ڕازی نابێت شوو بەکەسێك بکات لە ڕووی بنەچەو ناوبانگ و سەروەت و سامانەوە ئاستی نزمتر بێت لە خۆی چونکە پێی وایە ئەم هاوسەرگیریە لە ئاستی دادەبەزێنێت و لە گەورەیی و شکۆی کەم دەکاتەوە، بەڵام پێغەمبەری خودا (درودی خودای لێبێت) لەم کارەی مەبەست و ئامانجێکی گەورەتری هەیە، ئەویش بەرزکردنەوەی کۆیلەیە لەو پلە کەمەی کە لەلایەن کۆمەڵگە ستەمکارەکانەوە پێی درابوو بۆ ئاستێکی بەرزتر لە پلەوپایەی گەورەکانی قوڕەیش .. بەڵکو لە پێناوی ئەوەدا کە ڕەگ وڕیشەی دەمارگیری نەفامی لەبن بهێنێت.

پێغەمبەری خودا (دوردی خودای لێبێت) بەمەشەوە نەوەستا:

- بەڵکو زەیدی کوڕی حاریسەی کۆیلەی خۆی کردە سەرکردەی سوپایەك کە کۆچەران و پشتیوانانی گەورەی قورەیشیان تێدابوو بۆ جەنگ کردن لەگەڵ ڕۆم لە جەنگی (مؤتە)دا ڕەوانەی کردن، هەروەها کوڕەکەشی (ئوسامەی کوڕی زەیدا) کر د بە سەرکردەی

سوپایەك كە ابوبكرو عومەر وەزیرانی پێغەمبەری خودا (درودی خودایان لێبێت) و دوو خەلیفەكەی دوای خۆی سەربازی ئەو سوپایە بوون. بەم كارانەشی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەك هەر كۆیلەكانی یەكسان كرد لەگەڵ مرۆڤە ئازادەكان بەڵكو مافی سەركردایەتی مرۆڤە ئازادەكانیشی پێدان، هەروەك پێشەوا بوخاری گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمویێت (إسمَعوا وَ أطيعُوا وَلَو إستَعمَلَ عَلَيكُم عَبدٌ حَبَشِي كَأنَ رَأسَهُ زَبيبَةٌ مَا أَقامَ فِيكُم كِتابُ اَلله) واتە گوێڕایەڵ و ملكەچ بن ئەگەر بەندەیەكی حەبەشیش سەروكارتان بێت كە سەری وەك رەشە ترێی وشكراوە وا بێت، مادەم بە كتابی خوا فەرمانڕەوای دەكات لە نێوانیاندا.

بەم كارەش مافی گرتنەدەستی بەرزترینی هەموو پلەكانی بەخشی بە كۆیلەكان، كە بریتیە لە پێشەوایەتی كردنی موسوڵمانان بەو مەرجەی لێهاتووبێت و شیاوی گرتنەدەستی ئەو پۆستەبێت، هەروەك خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی (لَو كانَ سَالِم مَولى أبي حُذَيفَة حَيّا لَوَلَيتَهُ) واتە: ئەگەر سالمی كۆیلەی ابی حوزەیفە بمایە دەمكردە بەرپرس، پێشەوا عومەر لەسەر ئەو ڕێگایە دەڕۆشت كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بناغەی دانابوو.

گومانی تێدا نییە كەئەم هەڵسوكەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و جێنشینە بەڕێزەكانی دوای خۆی جگە لەوەی كە بووە هۆی بەرزكردنەوەی ڕێزو حورمەتی كۆیلە و خزمەتكارەكان ، لە ڕەگ دەرهێنان و ڕیشەكێش كردنی شانازی كردن بە بنەچەو پشتەوە، بەخشینی پلە و پۆستیش بوو بە كەسە بەهێزەكان، بێ گوێدانە بنەچەو ڕەگەزو ڕەنگیان .. ئەوەی ئەم راستیەش پشتڕاست دەكاتەوە ئەوەیە كە هەندێك لە دووڕوان ڕەخنەیان

گرت لە سەرکردایەتی (اسامەی کوری زەید) پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (أن يَطعَنوا بِإمرة أسامة فَقَد طَعَنوا بِأمرة أَبِيهِ مِن قَبل، فَوَاللهِ إِنَّ أسامَةَ لَجَدير بِالامارَةِ كَما أَنَّ أَباهُ لَجَديرٌ بِها)

واتە: ئەگەر تانە لە سەرکردایەتی ئوسامە بدەن ئەوە بەدڵنیاییەوە پێشتریش تانەیان داوە لە سەرکردایەتی باوکی، سوێند بە خوا ئوسامە شایەنی سەرکردایەتی یە هەروەك چۆن باوکیشی شایەن بووە .

ئەو پرۆگرام و راسپاردە و نمونانەی کە ئیسلام دایناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلەو ڕێزگردنی و چاکەکردن لەگەڵیدا، مەبەست لێی - هەروەك لە باسی ئازادی کۆیلەدا دێینە سەری - بۆ ئەوەیە کە کۆیلە هەست بکات مرۆڤێکە خاوەن کیان و ڕێز و پێگەی مرۆڤایەتیە، هەتا دەگاتە ئاستێك لە قوڵایی ویژدانیەوە هەست بەوە دەکات کە مافی ڕێزو ژیانی هەیە... ئیتر داوای ئازادی خۆی دەکات، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ڕێگای ئازادی دەگرێتەبەر بۆ ئەوەی بەتەواوی لە کۆیلایەتی و بەندایەتی ئازادی ببێتو لەکۆتاییدا بچێتە ڕیزی مرۆڤە ئازادەکانەوە.

ئەمە لەکوێ و ئەو مامەڵە ستەمکارییە لەکوێ کە لەپێش هاتنی ئیسلام و دوای ئیسلامیش لەگەڵ کۆیلەدا دەکرێت، بەشێوەیەك تەماشای کۆیلەیان دەکرد، کە لەڕەگەزی گەورەو سەردارەکان نین... بەڵکو بەو چاوەوە تەماشایان دەکردن کە بۆئەوە دروستکراون خزمەتی گەورەکان بکەن و بکرێن بە کۆیلەو بەردەستی گەورەو دەوڵەمەندەکان!!! هەر بۆیە هەرگیز هەستیان بە تاوان نەدەکرد بە کوشتن و سزادان و داخ کردن و ناچارکردنیان بەئەنجامدانی قورسترین و قێزەونترین کاروبارەکان!!

## ئیسلام چۆن کۆیلەی ئازادکرد؟

پێشتر باسمان لەوە کرد کاتێك کە ئیسلام بەرنامەو راسپاردەکانی خۆی دانا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کۆیلەکان لەڕووی: کۆمەڵایەتی، بەباشی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیان، رێزگرتنیان، چاك بوون بۆیان. مەبەست لێی ئەوەبوو کە کۆیلە هەست بە بوون و کەرامەتی مرۆڤانەی خۆی بکات، بۆئەوەی کاتێك بەڕاستی هەستی بەو بوونە مرۆڤانەیەی خۆی کردوو تام وچێژی راستەقینەی ئەو رێزو کەرامەتەی کرد، داوای ئازادبوونی لە کۆیلایەتی بکات، رێگای ئازادبوون بگرێتەبەر هەتا لەکۆتاییدا ئازادی تەواوەتی بەدەست بهێنێت.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئیسلام پێش ئەوەی بە کردار کۆیلەکان ئازاد بکات، هاتووە لەڕێگای ئەو بەرنامەیەی دای ناوە لەناخ و قوڵایی ویژدانیەوە کۆیلەکەی ئازاد کردووە، بۆ ئەوەی هەست بە بوونی خۆی بکات و بەڕاستگۆیی و عەزیمەتەوە داوای ئازادی بکات، کە هەر ئەمەشە دەستەبەریی راستەقینە بۆ ئازادبوون!!

ئازادکردنی کۆیلە بە دەرکردنی فەرمان - هەروەك محمد قطب - دەڵێت نەدەبووە هۆی ئازادکردنی کۆیلەکان... ئەزمونی ئەمریکا لە ئازادکرنی کۆیلەکان لەسەر دەستی (ئەبراهام لنکۆڵن) بە یەك واژۆ شایەتێکی ئاشکرای ئەوەیە کە دەیڵێین، چونکە ئەو کۆیلانەی لەسەر دەستی لنکۆڵن - لە رووکاردا- بە دەرکردنی یاسا ئازادی کردن

بەرگەی ئازادبوونیان نەگرت و هەر زوو - لەناخەوە - گەڕانەوە بۆلای گەورەکانیان، ئازاد نەبوون!! بۆچی؟.

لەبەرئەوەی ژیانیان لەژێر سایەی کۆیلایەتی بەردەوامدا وای لە ئامرازی دەروونی و ویژدانییان کردبوو کە لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا رابێن، بۆیە ئامێری گوێڕایەڵی و ملکەچیان گەشتبووە ئەوپەڕی، ئامرازی هەستکردن بە بوون و کەرامەتیشیان تا ئەوپەڕی رادەی خۆی کزولاواز بووبوو!!

جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان یاسای خوا کە مرۆڤ هاندەدات بۆ داواکرنی ئازادی و هۆکارو ئامرازی بۆ دابین دەکات و هەرکات و ساتێك داوای بکەن ئەو ئازادیەیان دەداتێ، لەگەڵ یاسا دانراوەکانی تردا کە لێ دەگەڕێت کاروبارەکان ئاڵۆزدەبن و تەنگ و چەڵەمە دروست دەبێتو بەو هۆیەشەوە شۆڕشە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان بەرپا دەبن و سەدەها و هەزارەها مرۆڤ تیادا دەبنە قوربانی، سەرەنجامیش بەزۆرو ناچاری نەبێت ئازادی نادرێت بەوکەسانەی کە داوای دەکەن!!

لە باشی یە گەورەکانی ئیسلام دەربارەی بەندە ئەوەبوو کە ئیسلام پێداگری کرد بۆ ئازادکردنی کۆیلە لە ناخ و دەرەوەشیاندا.

لەڕووی دەرونیەوە: وای لێ کردووە لەناخەوە هەست بکات بە نیعمەتی ئازادی و هەوڵدان بۆ ئەوەی بەهەر نرخێك بووە بەدەستی بهێنێت. لەڕووی دەرەکیەوە: یاسا و رێسای دانا بۆ ئەم پرۆسەی ئازاد کردنە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئیسلام بۆ ئازادی کۆیلەکان تەنها پشت بە نیەتیکی چاك نابەستێت وەك ئەوەی (ئەبراهام لنکۆڵن) کردی بە دەرکردنی یاسایەك کە لە دەروونی هاوڵاتیاندا هیچ بەهاو

نرخێکی نەبوو، کە سەلمێنەری ئەو راستییەیە ئیسلام زۆر بەقوڵی لە سروشتی مرۆڤایەتی تێگەیشتووەو ئاگادارە لە باشترین هۆکارەکانی چارەسەرکردنی ئەم دۆزە.

با ئەوەش لەولاوە بوەستێت کە هەستا بە پێدانی ماف بەخاوەن مافەکان و پەروەردەکردنیان و ئامادەکردنیان لەسەر دەستگرتن بەو مافانەو بەرگەگرتنی شوێنەوارەکانی... بەرلەوەی ململانێ بکەن لەپێناوی ئەو مافانەدا - وەك چۆن لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا روویدا - ئەو ململانێ بێزراو و ناشرینەی کە هەست و ویژدانی مرۆڤایەتی وشك دەکات و رق و کینە دەچێنێت لەدەروونی مرۆڤدا و دەبێتە هۆی خراپکردنی هەموو ئەو شتانەی کە رەنگە مرۆڤایەتی لەو رێگایەدا بەدەستی بهێنێت!! دوای ئەم ئاوڕدانەوە گرنگە کورتەی ئازادکردنی کۆیلە لە ناخەوە، دەگەڕێینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی بەرنامە دانراوەکەی خوا بۆ ئازادکردنی کۆیلە لە دەرەوە، بۆ ئەوەی هەرکەس بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت ئەوە بزانێت کە ئیسلام بەرنامەی خۆی هەیە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و ڕزگارکردنیان لە کۆت و بەندی بەندایەتی.

ئەو بەرنامەیەی ئیسلام دایناوە بۆ ئازادکرنی کۆیلە خۆی لەم هۆکارانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

ا ـ ئازادکرنی کۆیلە بە هاندان (ترغیب).

ب ـ ئازادکردنی کۆیلە بە کەفارەت و قەرەبووکردنەوەی گوناه.

ج ـ ئازادکردنی کۆیلە بە نامەکاریی (مکاتبة)

د ـ ئازادکردن بە بریکارنامە لەلایەن دەوڵەتەوە.

هـ ـ ئازادکردن بە بوون بەدایکی منداڵ.

و ـ ئازادکردن بە لێدانێکی توند.

## ئـازادکردن بەهاندان:

بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلە لەلایەن گەورەی کۆیلەکانەوە بەنیازی بەدەستهێنانی خێرو پاداشت... بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کۆیلەکە ئازاد دەکات بەهەشت بەدەست بهێنێت و لە سزای دۆزەخ ڕزگاری ببێت.. ( فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ) القمر: ٥٥

واتە: لە نیشتگەیەکی پەسەندان لای پاشایەکی بە دەسەڵاتی توانا.

ئیسلام بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هانی خاوەن کۆیلەکانی داوە کە هەستن بەئازادکردنی کۆیلەکانیان (فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ) البلد : ١١ ـ ١٣

واتە: کەچی هێشتا (زۆرێك لە خەڵکی) پەلاماری پلەی سەختی نەداوە، تۆ چوزانیت پلەی سەخت کامەیە، ئازاد کردنی کۆیلەیە.

هەرچی ئەو فەرموودانەشە کە خێروپاداشتی ئازادکردنی کۆیلەیان روون کردۆتەوە لەژمارە نایەن، بۆیە لێرەدا چەند دانەیەکیان دەخەینە ڕوو: رَوى إبن جَرير عَن أبي نَجيح قال : سَمِعتُ رَسولَ الله (ﷺ) يقول ( أيما مسلم اعتق رجلا مسلما فإن الله جاعل وفاء كل عظم من عظامه عظما من عظام محرره من النار، وأيما مسلمة امراة اعتقت امراة مسلمة فإن الله جاعل وفاء كل عظم من عظامها عظما من عظام محررها من النار)

واتە: هەر موسڵمانێکی پیاو پیاوێکی موسڵمانی کۆیلە ئازاد بکات ئەوا بە ژمارەی ئەو ئێسکانەی کە پیاوە ئازادکراوەکە تیایدایە ئێسکی پیاوە ئازادکەرەکە لە ئاگر دەپارێزێت، هەر ئافرەتێکی

موسڵمان ئافرەتێکی موسڵمانی کۆیلە ئازاد بکات ئەوا خوای گەورە بە ژمارەی ئێسکەکانی ئافرەتە کۆیلەکە ئێسکەکانی ئازادکەرەکە لە ئاگر دەپارێزێت ..

ـ وروى الامام احمد عن عمرو بن عنبسة أنه حدثهم ان النبي (ﷺ) قال : (من بنى مسجدا ليذكر الله فيه بنى الله له بيتا في الجنة، ومن اعتق نفسا مسلمة كانت فديته من جهنم، ومن شاب شيبة في الاسلام كانت له نورا يوم القيامة)

واتە: هەر کەسێك مزگەوتێك دروست بکات بۆ ئەوەی یادی خوای تیادا بکرێت ئەوا خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات و پێی دەبەخشێت، هەرکەسێك بەندەیەك ئازاد بکات ئەوە دەبێتە بریتی ئازادبونی لە جەهەنم، هەر کەسێك گەنجێتی لە ئیسلامدا پیر بکات ئەوا خوای گەورە بۆی دەکات بە ڕووناکی لە ڕۆژی دواییدا.

ـ وروى ابوداود و النسائي عن عمرو بن عنبسة قال : سمعت رسول الله (ﷺ) يقول (من اعتق رقبة مؤمنة اعتق الله بكل عضو منه عضوا من النار).

واتە: هەرکەسێك بەندەیەکی بڕوادار ئازاد بکات ئەوا بە هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە ئەندامەکانی ئەو کەسە ئازاد دەکات لە ئاگر.

ـ وروى الامام احمد عن البراء بن عازب قال : جاء الاعرابي إلى رسول الله (ﷺ) فقال يارسول الله علمني عملا يدخلني الجنة فقال (أعتق النسمة، وفك الرقبة)

فقال الأعرابي : يارسول الله أوليستا واحدة؟

قال: ( لا، إن أعتق النسمة أن تنفرد بعتقها، وفك الرقبة أن تعين في عتقها).

واتە: دەشتەكیەك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كارێكم فێر بكە كە بە هۆی ئەنجامدانیەوە بچمە بەهەشت، فەرمووی: نەفسێك ئازادكە، كۆیلەیەك ئازادكە (..دەشتەكیەكە وتی: باشە ئەو دوانە هەر یەك نین؟

فەرموی: نەخێر، ئەگەر نەفسێك ئازد بكەیت ئەوە تەنها خۆت بەشداریت، بەڵام كۆیلە ئازادكردن ئەوەیە هاریكاری بكەیت لە ئازادكردنیدا..

- وروى الشيخان و غيرهما عن سعيد بن مرجانة أنه سمع أبا هريرة (رضي الله عنه) قال : قال رسول الله (ﷺ) : ( من أعتق رقبة مؤمنة أعتق الله بكل إرب منها (اي عضو ) إربا منه من النار، حتى ليعتق باليد اليد، وبالرجل الرجل، والفرج الفرج .....)

واتە: بوخاری و موسلیم و جگە لەوانیش لە سعیدی كوڕی مەرجانە دەگێڕنەوە كە بیستویەتی لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لەسەر وتی: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەركەسێك كۆیلەیەكی بڕوادار ڕزگار بكات ئەوا بە ژمارەی هەموو ئەندامەكانی_كۆیلەكە ئەندامی ئازادكەرەكەی ڕزگاردەكات لە ئاگر، هەتا لەبەر دەستی دەپارێزێت و قاچی بە قاچی و داوێنی بە داوێنی ...

قال علي بن الحسن لسعيد راوي الحديث: أنت سمعت هذا من ابي هريرة؟ فقال سعيد: نعم.

فقال علي لغلام له ادع (مطرفا) (احد غلمانه)، فلما قام بين يديه قال اذهب فأنت حر لوجه الله.

ASTANA

واتە: علی کوڕی حسن بە سعیدی گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێت: ئایا ئەوەت بیستووە لە ئەبی هورەیرە؟ سعید وتی: بەڵێ.

علی وتی بە کۆیلەکەی، بڕۆ تۆ ئیتر ئازادی لەبەر خوای گەورە.

بەرهەم و ئەنجامی ئەم ڕێنماییانەی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەبارەی گەورەیی پاداشتی ئازادکردنی کۆیلە، بریتی بوو لەوەی کە موسوڵمانان بە راستگۆیی و دڵسۆزیی و بەسنگی فراوان و بەشێوەیەکی بێوێنە چوون بەدەم پڕۆسەکەوە، بەو ئومێدەی ڕەزامەندی خواو بەهەشتی نەبڕاوە بەدەست بهێنن لەڕۆژێکدا کە نە ماڵ سوودی هەیەو نە منداڵ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی بووە پێشەنگیکی چاك لە ئازادکردنی کۆیلە، بەوەی کە هەرچی کۆیلەیەکی لابوو ئازادی کردن، دوای ئەویش هاوەڵە بەڕێزەکان شوێن پێی ئەویان هەڵگرت.

ئەبو بکری صدیق (ڕەزای خوای لەسەر) لە مەککە پارەیەکی زۆری لە کڕینی کۆیلە لە گەورەکانی قورەیش سەرف دەکرد، بۆ ئەوەی ئازادیان بکات و ئازادییان بۆ بگەڕێنێتەوە.

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە ژمارەیەکی زۆری کۆیلە بەڕێگەی ئارەزوومەندانە و خۆبەخشانەی سەرچاوەگرتوو لە ئیمان و باوەڕەوە ئازادکراون، بە ئومێدی دەستکەوتنی پاداشت لەلایەن خوای گەورەوە.

ئەم ژمارە زۆرەش لە کۆیلە ئازادکردن نمونە و هاوشێوەی نەبووە نە لە پێش ئیسلام و نە لە دوای ئیسلامیش، هەروەها هۆکاری ئەم ئازادکرنەش بەتەواوی مرۆڤانە بووە، هەڵقولاوە لە ویژدانی خەڵك و باوەڕبوونیان بە بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا، جگە لەوە هیچ پاڵنەرێکی تر لەپشتی ئەم کارەیانەوە نەبووە!!

## ئازادکرنی کۆیلە بە لەبریتی گوناهبارییی (کەفارەت)

ئەمە یەکێکە لە گەورەترین هۆکارە شەرعیەکانی ئازادکردنی کۆیلە، قورئانی پیرۆز لە چەند بۆنەیەکدا باسی لە ئازادکردنی کۆیلە کردووە وەك هۆکاریك بۆ سڕینەوەی ئەو گوناهـ و هەڵانەی موسڵمان ئەنجامیان دەدات ..

ئای چەند زۆرن ئەو گوناهـ و سەرپێچیانەی موسوڵمانان لەژیانی رۆژانەیاندا ئەنجامی دەدەن!!!

جا کاتێك یەکێك لە ڕێگاکانی سڕینەوەی ئەو گوناهانە بریتی دەبێت لە ئازادکردنی کۆیلە، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئیسلام هەوڵێکی زۆرو نەبراوەی داوە بۆ ئازادکردنی زۆرترین ژمارەی کۆیلە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا!!.

لەخوارەوە گرنگترین هۆکارەکانی ئازادکردنی کۆیلە بۆ سڕینەوەی گوناه دەخەینە ڕوو کە لەقورئاندا هاتوون:

ـ کەفارەتی کوشتنی هەڵەی داناوە بە ئازادکردنی کۆیلە و دانی خوێنبایی بە کەسوکارەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت [وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ] النساء : ٩٢ .

واتە: وە هەر کەسێك ئیمانداریك بە هەڵە بکوژێت ئەوە (لەسەریەتی) ئازاد کردنی کۆیلەیەکی باوەڕدار وە (نرخی) خوێنێکیش بدات بە کەسوکاری کوژراوەکە.

ـ کەفارەتی کوشتنی کەسێك لە نەتەوەیەك بێت کە لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا بەڵێن و پەیمان هەبێت ئەوەیە کە دەبێت کۆیلەیەك

ئازاد بکات، هەروەك دەفەرموێت [وَإِن كَانَ مِن قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ] النساء : ٩٢ .

واتە: وە ئەگەر کوژراوەکە لە گەلێك بوو کە لە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمان هەبوو، ئەوا نرخی خوێنێك بدەنە کەسی کوژراوەکە لەگەڵ ئازاد کردنی کۆیلەیەکی ئیماندار.

- یەکێك لەو شتانەی دەکەوێتە بری کەفارەتی سوێندی درۆ بریتیە لە ئازادکرنی کۆیلە، خوای گەورە دەفەرموێت [وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ] المائدة: ٨٩

واتە: بەڵام خودا لێتان دەگرێ (بەگوناهبارتان دادەنێ) بە شکاندنی سوێندێ کە بە نیازی دڵ داتان بەستبێت جا کەفارەتی سڕینەوەی شکاندنی ئەو سوێندانە خۆراك پێدانی دە هەژارە لە خۆراکی مامناوەند کە دەرخواردی منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن یان پۆشاکی دە هەژار یان ئازاد کردنی بەندەیەك.

- بۆ کەفارەتی ظهار[1]، ئەگەر موسڵمان ئەم وشەی بە دەمدا هات و پاشان پەشیمان بووەوە دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکات:

---

(١) واتە پیاوێك بە ژنەکەی بڵێت (أنت حرام علی کظهر امي) واتە پشتت وەك پشتی دایکم وایە، مەبەستی ئەوەیە کە بە ژنەکەی بڵێت: تۆ وەك دایکم وایت. لێرەدا ئەو ژنەی لەسەر حەرام دەبێ تاوەکو کەفارەتێك نەدات کە ئازادکردنی کۆیلە یان خواردنی شەست کەس یان دوومانگ بە دوای یەکدا بەرۆژوو بێت ..وەرگێر

ASTANA

[وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ] المجادلة : ٣

واتە: ئەوانەی (زیهار) دەکەن لەگەڵ هاوسەرەکانیان لە پاشان دەگەڕێنەوە (پەشیمان دەبنەوە) لەوەی کە وتویانە واتە (خێرا تەلاقیان نادەن) ئەوە پێویستە بەندەیەك ئازاد بکەن لە پێش ئەوەی بەیەك بگەن.

ـ کەفارەتی ڕۆژوو شکاندنی ئەنقەست ئەوەیە کە دەبێت هەر لەڕێوە کۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەمەش لە سوننەتی ڕاستی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر) چەسپاوە.

ئەمە جگە لەو حاڵەتانەی دیکەی ئازادکردنی کۆیلە کە موسڵمان بە شێوەیەکی سوننەت دەیانکات بۆ سڕینەوەی هەر تاوانێك کە لە قورئاندا کەفارەتی بۆ دیاری نەکراوە [١]، هەموو ئەمانەش لەپێناوی ئازادکردنی زۆرترین ژمارەی کۆیلەدایە: (وا باشە ئاماژەیەکی تایبەت بکەین بۆ کەفارەتی کوشتنی هەڵە) هەروەك باسمان کرد کەفارەتەکەی خوێنباییە و دەبێت بدرێتە ماڵی کوژراوەکە لەگەڵ ئازادکردنی کۆیلەیەکدا، چونکە ئەو کوژراوەی بە هەڵە دەکوژرێت مرۆڤێکە و کەسوکارەکەی و کۆمەڵگەش بە بێ هۆکارێکی ڕەوا لەدەستیان داوە.

لەبەر ئەمە ئیسلام بڕیار دەدات بە بژاردنەوەی لە دوو ڕووەوە: بژاردنەوەی بۆ کەس و کارەکەی بەپێدانی خوێنبایی، وە بژاردنەوەی بۆ کۆمەڵگا بە ئازادکردنی بەندەیەکی ئیماندار؟!. وەك ئەوەی

---

(١) خوای گەورە دەفەرموێت (إن الحسنات يذهبن السيئات) واتە چاکەکردن دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناحەکان

ئازادکردنی کۆیلە بریتی بێت لە زیندووکردنەوەی مرۆڤێك لەبری ئەو کەسەی بەهەڵە ژیانی لەدەستداوە.

سەرەڕای هەموو ئەو دەستەبەریانەی بۆ کۆیلە دانراوە بەمەبەستی پارێزگاری لێکردنی کەچی بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکان لە دیدی ئیسلامی یەوە مردن یان شێوەیەکە لە مردن، بۆیە نایەڵێت هیچ هەلێکی لەدەست دەربچێت بۆ زیندووکردنەوەی کۆیلەکان، ئەمیش لەرێگای ئازادکردنیان لە کۆیلایەتی.

## ئازادکردن بە پسوولە بۆ نوسین (مکاتبة):

بەخشینی ئازادییە بە کۆیلە هەرکاتێك خۆی داوای کرد لەبەرامبەر بڕێك پارە کە کۆیلەو گەورەکەی لەسەری رێك دەکەون، بەو مەرجەی کۆیلەکە ئەو پارەیە بەشێوەی قیست بدات بە گەورەکەی، جا ئەگەر پارەکەی دا ئەوە ئازاد دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ] النور: ٣٣

واتە: وە ئەوانەی داوای نوسراو دەکەن (بۆ کڕینەوەی خۆیان) لە بەندەو کەنیزەکەکانتان، ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ کڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد (کە بریتیە لە توانای دانی ئەو پارەیەی کە ئەبێ بیدات بەخاوەنەکەی بۆ ئازاد بوونی) وە لەو ماڵەی کە خودا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن.

ASTANA

## دوو وتەی زانایان:

ئایا پێویستە لەسەر گەورەی كۆیلە وەڵامی بەندەكەی بداتەوە بۆ موكاتەبە كردن؟

**وتەی یەكەم:** پێویست نیە، بەڵكو سوننەتە، ئەمەش وتەی جمهوری زانایانە.

بەڵگەی ئەم زانایانە وتەی خوای گەورەیە [إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا]، چونكە دەستەواژەی: [إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا] بەڵگەو قەرینەیەكی ئاشكرایە بۆ گۆڕینی حوكمی ئایەتەكە لە واجبەوە بۆ سوننەت، واتە [فَكَاتِبُوهُمْ] ئەم وشەیە فەرمانە بەڵام فەرمانەكە دەبێتە سوننەت، بە قەرینەی ئەو ئایەتەی سەرەوە... ئەگەر كۆیلەیەك بە گەورەكەی وت موكاتەبەم لەگەڵ بكە بەو بڕە پارەیە، گەورەكەشی وتی: من لەم موكاتەبەیەدا خێری بۆ تۆ تێدا نابینم، لێرەدا وتەی گەورەكەی لەپێش ترە، چونكە ئەو باشتر ئاگاداری بارودۆخی كۆیلەكەیەتی لە ڕووی ئەمانەت و چاكیەوە.

**وتەی دووەم:** هەركات كۆیلەكە ئەو بڕە پارەیەی دا كە لەسەری ڕێككەوتون، پێویستە گەورەكەی وەڵامی كۆیلەكەی بداتەوەو ئازادیشی بكات.

ئەوانەی خاوەنی ئەم بۆ چونەن هەروەك - قورتوبی - دەڵێت بریتین لە عیكریمە، عەتا، مسروق، عەمروی كوڕی دینار، زوحاكی كوڕی مەزاحم و كۆمەڵێك لە زاهیریەكان.

بەڵگەی ئەم زانایانەش كردەوەیەكی ئیمامی عومەرە ڕەزای خوای لێبێت، سیرینی باوكی محمدی كوری سیرینی كۆیلەی ئەنەسی كوڕی مالك داوای موكاتەبەی لە ئەنەس كرد، ئەنەس ڕازی نەبوو، پێشەوا

عومەر قامچی لێ بەرزکردەوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە [فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا] ئەنەسیش موکاتەبەکەی کرد، دیارە پێشەوا عومەر قامچی لە ئەنەس بەرز نەدەکردەوە ئەگەر بیزانیایە موباح یان سوننەتە.

ئەوەی زیاتر ئەم بۆچونەی دووەم بە هێز دەکات هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەیە [والذين يبتغون الكتاب ...].

ئەم ئایەتە هەروەك ـ قورتوبی ـ باسی دەکات لەبارەی کۆیلەیەکی حوەیتیبەوە دابەزی کە پێیان دەوت: (صبیح)، داوای موکاتەبەی لە گەورەکەی (حویطب) کردو ئەویش رازی نەبوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، ئیتر (حویطب) موکاتەبەی لەگەڵدا کرد لەسەر سەد دینار، لەو پارەیەیش بیست دیناریانی پێ بەخشی، (صبیح) پارەکەی پێداو ئەویش ئازادی کرد.

ئاینی ئیسلام لەڕێگای دانانی کۆمەڵێك یاساوە موکاتەبەی لەسەر کۆیلەکان ئاسان کردووەو لەخوارەوەیش گرنگترینیان باس دەکەین:

١ـ رووخسەتی داوە کۆیلە بە پارەی زەکات موکاتەبە بکات و خۆی ئازاد بکات[1]، خوای گەورە دەفەرموێت [إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ....... وَفِي الرِّقَابِ....] التوبە: ٦٠

---

(١) دیارە دانانی کۆیلە بە یەکێك لەو گروپانەی کە زەکاتیان پێدەشێت بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە بۆ گرنگیدانی ئیسلام بە کۆیلە و لە یاد نەکردنیانە لە کۆمەڵگادا، زەکاتیش بەردەوام دەدرێت لە کۆمەڵگای ئیسلامی و شوێن و کاتی دیاری کراوی نیە، کەواتە ئازادکردنی کۆیلەش بەو پارەی زەکاتە کات و شوێن نازانێت و بەردەوام دەبێت، هەر بۆیە بەچەند سەدەیەك دوای هاتنی ئیسلام کۆیلایەتی کە ڕەگی لە کۆمەڵگای ئیسلامی داکوتابوو لە ڕیشەوە دەرهێنرا. وەرگێڕ

واتە: بەڕاستی خێرەکانتان تەنها........ وە بۆ ئازادکردنی بەندەو کۆیلەکان.......

٢ـ ئەو پارەیەی کۆیلە دەیداتەوە بە گەورەکەی لە کاتی موکاتەبە بە شێوەی قست بێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە پێشەوا بوخاری و ئەبوو داوود لە دایکە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە کە فەرمووی: بریرە هاتە ژوورەوە بۆ لام و وتی: (إن أهلي كاتبوني على تسع أواق فضة في تسع سنين، كل سنة أوقية، فأعينيني .. واتە خاوەنەکەم دەیەوێت موکاتەبەم بکات بە نۆ ئۆقیە [1] زیو لە نۆ ساڵدا، بە شێوەیەك هەر ساڵەو ئۆقیەك، جا یارمەتیم بدە..

٣ـ پێویستە لەسەر گەورەی کۆیلە هاوکاری دارایی کۆیلە بکات کاتێك دەیەوێت موکاتەبە بکات بە پێی ئایەتی [وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ]

واتە: لەو پارەیەی خوای گەورە پێیداون ئێوەش لە کاتی موکاتەبەدا بەشی کۆیلەکانتانی لێ بدەن.

هاوکاریش دوو حاڵەتی هەیە:

- یان بە نەختی بیداتێ.

- یان بە دەست هەڵگرتن لە هەندێك پارەی موکاتەبەکە.

پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێبێت وای بە باش زانیوە کە ئەو بڕە پارەیەی گەورەکە دەستبەرداری دەبێت چوار یەکی نوسینەکەبێت، ئیبن

---

(١) ١١- ئۆقیە چەند گرامە؟

ASTANA

مەسعود ڕەزای خوای لێبێ پێی باش بووە لە یەك لەسەر سێی خۆش بێت ... بە بۆچوونی هەندێك لە زانایان ئەم یارمەتی و هاوکاری کردنەی کۆیلە لەلایەن گەورەکەیەوە کارێکی پێویستە.

ئیمامی شافیعی دەڵێت: گەورەی کۆیلە ناچار دەکرێت بە یارمەتی دانی بەندەکەی، دەسەڵاتداری موسوڵمان پێویستی دەکات لەسەر ئەوانەی میرات لە گەورەی کۆیلەکە دەگرن هەستن بە یارمەتی دانی کۆیلەکە ئەگەر هاتوو گەورەکەی مرد و یارمەتی کۆیلەکەی نەدابوو لەو موکاتەبەیەی لەگەڵیدا کردوویەتی.

٤ـ ئەگەر کۆیلە ئەو پارەیەی دا بە گەورەکەی کە لەسەری ڕێکەوتون ئەوە ڕاستەوخۆ ئازاد دەبێت و پێویست بەوتنی گوتەی گەورەکەی ناکات کە بڵێت ئەوە ئازادم کردی.

٥ـ ئیمامی قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا لە هەندێك لە پێشینەوە بۆمان دەگوێزێتەوە: ئەگەر لەنێوان کۆیلەو گەورەکەیدا گرێبەستی موکاتەبە کرا بۆ ئازادکردنی، ئەوە بەگوێرەی ئەو موکاتەبەیە ئازاد دەبێت و جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ کۆیلایەتیەکەی، بەڵام قەرزاری گەورەکەی دەبێت بەو بڕە پارەیەی کە لەسەری ڕێکەوتوون.

ئەم حوکمانەی ئیسلام دایناون بۆ موکاتەبەکردن هۆکارێکی یاسایی ترە بۆ ئازادکردنی کۆیلە لە کۆت و بەندی کۆیلایەتی، بەڵکو یەکێکە لە هۆکارە هەرە گەورەکانی کردنەوەی دەرگای ئازادکردن بۆ ئەو کەسانەی کە لەناخەوە حەز بەئازادکردنی خۆیان دەکەن لە کۆیلایەتی و چاوەڕێی ئەوە ناکات گەورەکەی لە دەرفەتێکدا کە لەوانەیە لە داهاتویەکی دووردا - ڕو بدات یان ڕو نەدات - بێبەرامبەر ئازادی

بکات، ئەمە بەبۆچوونی ئەوانەی کە پێیان وایە پێویستە لەسەر گەورە بچێت بەدەم داوای کۆیلەکەیەوە ئەگەر داوای موکاتەبەی کرد.

## ئازادکردن بە کەفالەتی دەوڵەت:

ئەمەش هۆکارێکی ترە بۆ ئازادکردنی کۆیلە لە کۆیلایەتی، بەڵکو یەکێکە لە هۆکارە هەرە گەورەکان لە ئازادکردنی هەزارەها کۆیلە کە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە.

ئیسلام لە پارەی زەکات پارەیەکی تایبەتی تەرخانکردبوو بۆ دەوڵەت بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان، قورئانی پیرۆز ئەم بانکەی ناوناوە (وفي الرقاب) کە دانراوە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا. خوای گەورە دەفەرمویێت [إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ] التوبة : ٦٠

واتە: بەڕاستی خێرەکانتان تەنها بۆ بێ نەوایان و هەژاران و کرێکارانێك کە بەسەریەوەن (کۆی دەکەنەوە) وە ئەوانەی دڵیان دائەهێنرێ بۆ (خۆشویستنی ئیسلام) وە بۆ ئازاد کردنی بەندەو کۆیلەکان و بۆ قەرزاران و لە ڕێی (بەهێز کردنی ئاینی ) خودادا و بۆ ڕێبواران، ئەمە پێویست کراوە لەلایەن خوداوە، وە خودا زانای کار دروستە.

یەکێك لەو بابەتانەی مێژوو ئیسلامی بەوپەڕی شانازییەوە بۆمان دەگێڕێتەوە ئەوەیە کە کلیل بەدەستی (بیت المال) لەسەردەمی خەلیفەکاندا هەرکاتێك ئەو پارەیەی لە بەیتول مالدا بووە زیاتر بوویێت

لە دابینکردنی پێویستیەکانی هەژاران و کەمدەستان هاتووە چەندەها بەندەی لەبازاری کۆیلە فرۆشاندا کڕیوەو پاشان ئازادی کردوون.

یحیی کوری سعید دەڵێت (بعثنی عمر بن عبدالعزیز علی صدقات إفرقیة، فجمعتها ثم طلبت فقراء نعطیها لهم فلم نجد فقیرا، ولم نجد من یأخذها منا، فقد أغنی عمر بن عدالعزیز الناس، فاشتریت بها عبیدا فأعتقتهم)

واتە عمر کوری عبدالعزیز ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ئەفریقیا، منیش دوای کۆکردنەوەی داوام کرد هەژارەکان بێن تاوەکو بەشیان بدەم هیچ هەژارێکم دەست نەکەوت، وە هیچ کەسێکیشم دەست نەکەوت لێمانی وەرگرێت، بەڕاستی عمر کوڕی عبدالعزیز ئەو خەڵکەی بێ نیازکردبوو لە پارە، بۆیە هاتم بەو پارەیە کۆیلەم کڕی و ئازادم کردن.

ئەمە جگە لەوەی کە دەوڵەت دەهات لە پارەی زەکات هاوکاری ئەو کۆیلانەی دەکرد کە موکاتەبەیان کردبوو بۆ ئەوەی خۆیان ئازاد بکەن، بەڵام ئەو پارەیەی لە ڕێگای ئیشوکارەوە دەستیان دەکەوت بەشی نەدەکرد، وەك لە پێشیشەوە باسمان کرد.

بەم ڕێگا جۆراوجۆرانە ـ هەروەك محمد قوتب دەڵێت ـ ئیسلام چەند هەنگاوێکی کرداری فراوانی هەڵگرت بۆ ئازادکردنی کۆیلە، بەمەش بەلانی کەمەوە حەوت سەدە کەوتە پێش پێشکەوتنی مێژووییەوە، جگە لەوەش هات رەگەزی تری بۆ دۆزی ئازادکردنی کۆیلە زیادکرد - وەك چاودێریکردنی دەوڵەت - کە لە سەرەتای چاخی نوێدا نەبێت جیهان نەگەیشتبوو بەو قۆناغە.

هەروەها کۆمەڵە رەگەزێکی دیکەیش کە ئیسلام دایناوە لە جیهاندا شتی وا نەبووە، وەك جوان هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کۆیلە یان ئازادکردنیان

بە خۆڕایی و لەبەر ڕەزامەندی خوا.... بە بێ هەبوونی فشاری گەشەکردنی ئابووری یان رامیاری یان کۆمەڵایەتی کە رۆژئاوایان ناچار بەئازادکردنی کۆیلەکان کرد.

بەم جۆرە کەشوفش و بانگەشە زانستییە پووچەکانی ڕێبازی شیوعیەت پوچەڵ دەبێتەوە، کە پێیان وایە ئاینی ئیسلامیش زنجیرەیەکە لە زنجیرەکانی گەشەسەندنی ئابوری و بە گوێرەی سوننەتی جەدەلیەتی ماددی لە کات و شوێنی سروشتی خۆیدا هاتووە، کە پێی وایە هەموو سیستمێك بە ـ ئیسلامیشەوە ـ هیچ نییە جگە لە رەنگدانەوەی ئەو گەشەسەندنە ئابوریەی کە لەکاتی دەرکەوتنی ئیسلامدا لە ئارادا بووە، وە هەموو بیروباوەڕو بۆچونەکانی لەگەڵ ئەو بەرەوپێش چوونەدا دەگونجێت و وەڵامدەرەوەیەتی و ناکرێت و ناتوانێت پێشی بکەوێت.

بەڵام ئەوە ئیسلامە لە یاساو ڕێساکانیدا - کە سیستمی ئازادکردنی کۆیلە یەکێکە لەوانە - بە حەوت سەدە کەوتۆتە پێش وادەی سروشتیی پێشکەوتنی مێژووەوە، ئیسلام کاری بەو سیستمە ئابوریە نەکرد کە لەو سەردەمەی نیمچە دوورگەی عەرەبی و جیهانیشدا هەبوو، نە لەبارەی کۆیلەوە و، نە لە بواری دابەشکردنی سەروەت و سامان و نە لەبواری پەیوەندی دەسەڵاتدار بە هاوڵاتیانەوەو نە لەبواری پەیوەندی خاوەن کار بە کرێکارەوە... بەڵکو سیستمی ئابوری و کۆمەڵایەتی و رامیاری خۆیی دانا بەپشتبەستن بە وەحی ئاسمانی و بەجۆرێك کە پێشتر هاوشێوەی نەبووەو هەتا ئێستا لە زۆرێك لە ڕێساو یاساکانیدا تایبەتمەندی خۆیی هەیەو جیاوازە لە تەواوی ئەو یاساو ڕێسایانەی تر کە بەدرێژایی سەردەمەکان و مێژوو هەبوون!!

## ئازادکردن بە بوون بە دایکی منداڵ [1]:

ئەمەش یەکێکی ترە لە هۆکارەکانی ئازادکردنی کۆیلە، وە یەکێکە لەکارە مەزنە جوانەکانی ئیسلام لە بواری رێزگرتن لە ئافرەت.

بۆیە دادەنرێت بە یەکێك لە هۆکارەکانی ئازادکردنی کۆیلە چونکە کاتێك کەنیزەکێك[2] دەبێتە کۆیلەی پیاوێکی موسڵمان، ئەوا بۆ پیاوەکە دروستە وەك خێزانەکانی خۆی بچێتەلای و سەرجێیی لەگەڵدا بکات، جا ئەگەر منداڵێکی لێی بوو دانی نا بەوەدا کە ئەوە منداڵی ئەوە، ئیتر لەدیدی ئیسلامەوە ئەو ئافرەتە دەبێت بە (دایکی منالەکە)، لەم حاڵەتەشدا حەرام دەبێت بۆ گەورەکەی بیفرۆشێتو ئەگەر پیاوەکە مردوو ئافرەتەکەی ئازاد نەکردبوو ئەوا ڕاستەوخۆ دوای مردنی پیاوەکە ئازاد دەبێت.

چەند ئافرەتی کۆیلە لە ڕێگای ئەم هۆکارەوە لە سەردەمەکانی پێشوودا ئازاد کراون؟! چەند ئافرەتی کۆیلە تامی ئازادییان چەشتووە کاتێك بوون بە دایکی منداڵ لە گەورەکانیان ؟!

لەبەر ئەوە دادەنرێت بە یەکێك لە کارە جوانە مەزنەکانی ئیسلام لە بواری ڕێزگرتن لە ئافرەت، چونکە ئەو ئافرەتەی لە وڵاتانی ناموسوڵماندا و لە جەنگەکاندا دەکرا بەکۆیلە بازرگانی و کاری داوێن پیسی پێوە دەکراو هەموو کەس بۆی هەبوو سەرجێیی لەگەڵدا بکات،

---

(١) دیارە مەبەست لەم منداڵە کوڕە یان کچ.

(٢) کۆیلەی ئافرەتە

نەك هەر ئەوە، بەڵكو ڕێزو كەرامەتیشی دەشكێنرا، شەرەف و ناموسی هەرزان دەكرا، مافیشی بە هەدەر دەچوو.

بەڵام بە كۆیلە كردنی ئافرەت لە سایەی سیستمی ئیسلامیدا جیاوازە لەو سەرشۆڕی و سوكایەتی پێكردنەی پێش هاتنی ئیسلام ڕووبەڕووی دەبویەوە، ئیسلام پارێزگاری لە مافەكانی كردو و ناموس و شەرەفیشی پاراست.

ئەو ئافرەتە تەنها كەنیزەكی خاوەنەكەی بوو جگە لەو كەسی تر مافی ئەوەی نەبوو بچێتە لای و وەك خێزانەكانی خۆی سەرجێیی لەگەڵدا بكات، مەگەر ڕێگەی درابێت شووبكات و بوویێتە خێزانی موسوڵمانێك، لەو كاتەشدا خاوەنەكەی نە بۆی هەبووە نزیكی بكەوێتەوەو نە بۆشی هەبوو بەتەنها لەگەڵیدا بێت.

ئەو مافەشی دراوەتێ كە ئەگەر ویستی لێ بوو بە موكاتەبە كردن خۆی ئازاد بكات.

دوای مردنی مێردەكەی خۆی و كوڕەكەشی ئازاد دەبوون، ئەگەر بهاتایە و لەو مێردەی منداڵێكی هەبوایە.

ئەمە جگە لەوەی كە پێویست بووە لە سەر گەورەكەی هەڵس و كەوتی جوان بكات لەگەڵی و بە بەخشندەیی و میهرەبانییەوە لە گەڵیدا بژی، بەو جۆرەی كە شەریعەتی ئیسلام فەرمانی پێ كردووە. بەم شێوەیە ئافرەت هەست بە بوون و كەسێتی خۆی دەكات و لەژێر سایەی بنەماكانی ئیسلامدا بەسەری بەرزو ڕێزەوە دێت و دەچێت.

## ئازادکردن بە لێدانی نارەوا:

ئەمەش هۆکارێکی ترە لە هۆکارە کانی ئازادکردنی کۆیلە لەلای هەندێك لە زانایان - لەوانەش حەنابیلەکان - پێشتریش باسی ئەو بەرنامەیەمان کرد کە ئیسلام دایناوە بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کۆیلە، بۆیە دروست نیە هیچ گەورەیەك لەم ڕێبازی جوان مامەڵەکردنەی نێوان خۆی و کۆیلەکەی لابدات، بەڵکو دەبێت ئەم پەیوەندییە بنیات نرابێت لەسەر ڕێزو خۆشەویستی و هاوسۆزی .. تاوەکو کۆیلە هەست بە بوون و کەسێتی و مرۆڤ بونی خۆی بکات، هەست بکات ئەویش دروستکراوێکە و وەك هەر مرۆڤێکی تر مافی ڕێزلێ گرتن و ژیانی هەیە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرزەشتی هاوەڵەکانی دەکرد ئەگەر ببینیایە یەکێکیان توندوتیژی ئەنجام دەدا بەرامبەر بەندەکەی و لێی دەداو سوکایەتی پێدەکرد، لە صحیحی بوخاریدا هاتووە کە جارێکیان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بینی باوکی مسعود لە بەندەکەی دەدا، ئەویش بە سەرزەنشتەوە پێی فەرموو: (إعلم یا أبا مسعود أن الله أقدر علیك من هذا الغلام)

واتە: بزانە ئەی باوکی مسعود، خوای گەورە بە تواناترە لە سزادانی تۆ وەك لەو توانایەی تۆ هەتە بۆ لێدانی ئەو بەندەیە، بەڵام ئەو دان بەخۆیدا دەگرێت ئەگەر تورەبێتو تۆ دان بەخۆتدا ناگریت.

ڕاستە ئیسلام ڕێگەی داوە بە تەمێ کردنی کۆیلە ئەگەر هاتوو کارێکی ناشرینی کرد، بەڵام لەهەمان کاتیشدا سنورێکی بۆ ئەو تەمێ

کردنە داناوەو گەورەی کۆیلەکە بۆی نییە ئەو سنورانە ببەزێنێت، خۆ ئەگەر بەزاندنی وەك ئەوەی کێشای بەڕوومەتیدا یان بدات لەو شوێنانەی کە شوێنی ئازارن، ئەوە ئەم لێدانە دەبێتە پاساوێکی شەرعی بۆ ئازادکردنی.

لە ئەسەردا هاتووە ( كنا بني مقرن على عهد رسول الله (ﷺ) ليس لنا خادم إلا واحدة ، فلطمنا أحدنا، فبلغ ذلك رسول الله (ﷺ) فقال إعتقوها . فقيل له: ليس لهم خادم غيرها، قال فليستخدمها فإذا استغنوا عنها فليخلوا سبيلها).

واتە: ئێمەی نەوەی مقرن لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تەنها یەك خزمەتکارمان هەبوو، ڕۆژێك یەکێکمان دای لە ڕوومەتی خزمەتکارەکەو ئەمەش گەشتەوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەمووی ئازادی بکەن، بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وترا: جگە لەو خزمەتکاری تریان نییە، ئەویش فەرمووی: بەکاری بهێنن، ئەگەر ئیشیان پێی نەما ئەوە با ئازادی بکەن.

ئیمامی موسلیم لە شوعبەوەو ئەویش لە فیراسەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: لە زەکوانم بیست لە رازانەوە دەیگێڕایەوە کەوا عەبدولآی کوڕی عومەر بانگی کۆیلەیەکی خۆی کرد، شوێنەوارێکی بینی لە لەسەر پشتی، پێی وت: ئایا ئازاردراوی؟ وتی: نەخێر، وتی: تۆ ئازادی، دەڵێت: پاشان هەندێك خۆڵی لە زەوی هەڵگرت و وتی: من هێندەی قورسایی ئەم خۆڵە پاداشتم لەم ئازاد کردنە وەرنەگرت، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو ( من ضرب غلاما له حداً لم يأته، أو لطمه فإن كان كفارته ان يعتقه)

ASTANA

واتە: هەرموسڵمانێك بە توندی بدات لە کۆیلەکەی یان لە دەموو چاوی ئەوا کەفارەتەکەی ئازادکردنیەتی.

ئای شەریعەتی ئیسلام چەند مەزنە لەوەدا کە فەرمانی کردووە بە نەرمونیان بوون لەگەڵ کۆیلەدا، لە هەڵنان و هاندانەکانی بۆ ڕێزگرتن و مامەڵەکردنی جوان لەگەڵیدا؟ چەندە بەرزو بڵندە کاتێك بڕیاری داوە لێدانی کۆیلە ببێتە پاساوێکی شەرعی بۆ ئازادکرنی لە کۆت و بەندی کۆیلایەتی و زەلیلی و سەرشۆڕی بەندایەتی؟!!

ئەمانەی باسمان کردن دیارترین ئەو خاڵانەن کە بنچینەکانی بەرنامەی ئیسلام جیادەکاتەوە کە دایناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلە...

بە بۆچونی زۆرێك لە هیچ سیستمێك لە سیستمە کۆمەڵایەتیەکانی جیهاندا شتی وەك ئیسلام بوونی نیە کە هاتبێت بانگەشە بکات بۆ ئازادکردنی کۆیلە لەڕێگای هۆکاری ئیجابی و کرداریی جۆراوجۆرەوە...

هەروەك بینیت برای خوێنەر:

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردنی کۆیلە بە ئارەزوو خۆڕایی بە ئومێدی دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا.

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردن بە هۆی سڕینەوەو کەفارەتی گوناح و سەرپێچیەکان.

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردن بە موکاتەبەکردنی کۆیلە لەگەڵ گەورەکەی بە بڕێك پارە کە لەسەری ڕێدەکەون.

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردن بە ئەو پارەیەی کە لە زەکات و کەفالەت کردنی دەوڵەتەوە دێت .

ASTANA

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردن بە هۆکاری لە دایك بوونی منداڵێك لە گەورەکەی.

لە بنەماکانی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە: ئازادکردن بەهۆی لێدان بەشێوەی توندوتیژی و زۆردارانە.

جا ئەگەر ئیسلام ئەم هەموو بنەمایانەی دانابێت بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان، ئایا بەعەقڵی کێدا دەچێت لەسەر زەوی موسڵماناندا کۆیلەیەك بمێنێ؟

ئەگەر نمونەی کۆیلایەتی بە ڕووبارێك بچوێنین کە تەنها یەك سەرچاوەی لاوازی هەبێت، لەهەمان کاتیشدا لەملاو لای ڕووبارەکەوە لق و پۆپی زۆرو بەهێزی لێ بوو‌بێتەوە، ئایا هیچ کەسێك هەیە پێی وابێت ئاوی ئەو ڕووبارە هیچی لێ بمێنێتەوە؟

کۆیلەش هەر بەهەمان شێوەیە لە سیستمی ئیسلامیدا، چونکە تەنها یەك سەرچاوەی بەکۆیلە کردنی لاواز[1] هەیە، کە ئەویش کۆیلە کردنی دیلی جەنگە، ئەویش لەکاتێکدا کە پێشەوای موسڵمانان بە دروستی بزانێت.

بەڵام سەرچاوەکانی ئازادکردنی کۆیلە زۆرو جۆراوجۆرن، هەروەك لە پێشەوە ڕوون کرایەوە.

---

(١) لەبەر دوو هۆکار بە لاواز وەسفی سەرچاوەی بە کۆیلەکردنی دیلی جەنگمان کرد: یەکەمیان: عادەتەن جەنگ کەمە. دووەمیان: سەرپشك کردنی گەورەو پێشەوای موسڵمانان بە هەڵبژاردنی یەکێك لەم خاڵانە: ئازادکردن بێ بەرامبەر، یان بەرامبەر شتێك، یان کوشتن، یان بە کۆیلە کردن. لە زۆربەی کاتەکانیشدا هەڵبژاردنەکە کۆیلە کردن نی یە.

لە بەرەنجامی ئەم دەرچەو ڕێگایانەشەوە چەند سەدەیەکە کۆیلایەتی بەیەکجاری کۆتایی هاتووەو لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هیچ شوێنەوارێکی نەماوە، ئەویش بەهۆی وشك کردنی سەرچاوەکانی و زۆری ڕێگاکانی ئازادکردنی کۆیلەوە... ئەمەش یاسای خوایە.... جا ئەوانەی بەپێچەوانەی خواوە یاسایان داناوە با نیشانمان بدەن کامەیە یاساکانیان، بەڵام ستەمکاران دان نانێن بە بەڵگەو نیشانەکانی خواداو نکوڵی دەکەن!!.

## بۆچی ئیسلام بەیەکجاری بە کۆیلەکردنی قەدەغە نەکرد؟

لە پێشەوە باسمان کرد کە ئاینی ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبی و شوێنەکانی تریشدا هەموو سەرچاوە کۆنەکانی بە کۆیلە کردنی وشك کرد، لە تواناشیدا هەبوو بە دەقێکی ڕوون و ڕەوان بەیەکجاری قەدەغەی بکات، وەك چۆن زینا و عارەق و سووخواردنی قەدەغەکرد... بەڵام ئەوەی نەکرد، بەهۆی ئەوەی کە سەرچاوەیەکی سەرەکی بە کۆیلەکردن مابوویەوە و لە هەموو شوێنێك کۆیلەی بەرهەم دەهێناو گەلان و وڵاتانیش لەهەموو جێگایەك کاریان پێ دەکرد، کە ئەویش کۆیلەکردنی جەنگەکان بوو، کە لەڕاستیدا ئیسلام بە دەقێکی ڕوون و ڕەوان ئەو سەرچاوەیەی کۆیلەکردنی بەیەکجاری لانەبرد، ئەوەش لەبەر کۆمەڵێك هۆکار بوو، کە گرنگترینیان بریتین لەمانە:

١ - هۆکاری جیهانی.

٢ - هۆکاری ڕامیاری.

٣- هۆکاری دەروونی.

٤ - هۆکاری کۆمەڵایەتی.

٥ - هۆکاری تەشریعی.

٦- هۆکاری ئابووری[١]

---

(١) هۆکاری ئابووری: دیارە لەو سەردەمەدا کۆیلایەتی هۆکارێکی باشی داهات و کاڵآیەکی بەنرخی بازرگانی بووە، بازاڕی تایبەت و بازرگانی تایبەتی هەبووە،

بە ویستی خوا بە شێوەیەکی درێژترو ڕوونتر لەسەر هەریەکە لەم هۆکارانە دەوەستین:

## هـۆکاری جیهـانی:

پێشترو لەکاتی قسەکردن لە لایەنی مێژوویی کۆیلایەتیەوە باسی ئەوەمان کرد کاتێ کە ئیسلام هات کۆیلایەتی لەلایەن هەموو سیستەمەکانی جیهانەوە دان پێدا نراوبوو کاری پێدەکرا، نەك هەر ئەوە بەڵکو ببوە کاڵایەکی ئابوری و دەستا ودەستی پێوە دەکرا و... پێویستیەکی کۆمەڵایەتی گرنگ بوو، هیچ کەس نکۆڵی لێ نەئەکرد، نەیشدەکرا هیچ کەسێك بیر لە گۆڕینی ئەم سیستەمە بکاتەوە.

دوای لابردنی سیستمی کۆیلایەتی کێ دەزانێت چی ڕوودەدات؟ لەوانەیە ڕۆژێك بێت جارێکی تر سیستمی بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکان لە جیهاندا سەر هەڵبداتەوە - بە تایبەت بەکۆیلەکردنی دیلی جەنگ - ئەوکات بەکۆیلەکردن دەبێتە سیستمێکی جیهانی کارپێکراو و دراوێکی ئابووری دەستاو دەست پێکراو و پێویستیەکی کۆمەڵایەتی گرنگ.

بۆیە ناچێ بە عەقڵدا، کە جیهان بگەڕێتەوە سەر ئەم دۆخەو ئیسلامیش لەئاستیدا دەست بەستراوبێت، لەم کاتەدا ئیسلام لەسەر

---

وازهێنان لەم بازاڕە گەرم و گوڕ و پڕقیمەتە مایەی لاسەنگ بوون و بێهێز بوونی گیرفانی زۆرێك لەو کەسانە دەبوو کە بە گەرمی ئەم بازاڕە گیرفانیان گەرم دەکردەوە هەروەها ئازادکردنیان بەیەك بڕیار ئاڵۆزییەکی ئابووری گەورەی دروست دەکرد، چونکە ئەم کۆیلانە هیچ بازرگانییەك نازانن و خاوەنی زەوییەکی کشتوکاڵیش نین تا پشت بەست بەو سەرچاوەیە داهاتی ڕۆژانەیان پەیدا بکەن. وەرگێڕ

بنەمای مامەڵەكردنی هاوشێوە مامەڵە دەكات، بەڵكو هەڵدەستێ بە گرتنەبەری ئەو هۆكارو ڕێوشوێنانەی كە ئەم سیستمە بگۆڕێت یان بەیەكجاری لای بەرێت، ئەمەیش پێویستی بە كاتێكی درێژ دەبێت، پێویستی بەوە هەیە كە خەڵكی لە حەقیقەتی ئیسلام و تێڕوانینە فراوانە گشتگیرەكەی لەبارەی گەردوون و ژیان و مرۆڤەوە تێبگەن... هەروەها پێویستی بەوە هەیە بە كۆیلە كراوەكان هەست بەمانای سەربەرزی مرۆڤانە و حەقیقەتی كەرامەتی مرۆڤانەی خۆیان بكەن... بۆ ئەوەی دوای چێژكردنی مانای سەربەرزی داوای ئازادبوون لە سەرشۆڕی و رزگاربوون لە بەندایەتی بكەن.

بەندایەتی لە سەدەی بیستەم – هەروەك دواتر باسی دەكەین إن شاءالله - شكڵێكی تری وەرگرتووە، لە كۆیلەكردنی زەوی و دیل و كۆیلەكردنی لاوازەكان لەلایەن گەورەكانەوە گۆڕاوە بۆ كۆیلەكردنی هەموو میللەتان...وەك ئەوەی دەوڵەتە داگیركەرە داخ لە دڵەكان و حكومەتە شیوعیە بێباوەڕەكان دەیكەن... بە شێوەیەك سەرلەبەری ئەو گەلانە هەڵدەوەشێننەوە و ئیرادە و هێزیان لێدەسێنن و ئازادییان لێ زەوت دەكەن و بە ئاگر و ئاسن حوكمیان دەكەن ... ڕێگا نادەن كەس سەر بەرزكاتەوە و هیچ زمانێك بێتە گۆ، هەموو خێرو بەرەكەتێكی ئەو گەلانە و ئەو هەوڵ و كۆششانەی لە بواری كارو ئابوریدا دەیدەن پێویستە ڕام بكرێت و بخرێتە خزمەتی تاغوتە داگیركەرەكان، یان حكومەتە شیوعیە بێ دینەكانەوە، تا ئەوانیش سەرفی بكەن بۆ زیاتر بە كۆیلە كردنی گەلەكان و ملكەچكردنیان و كپ كردنی ئازادیەكان و كوشتنی ڕێزو كەرامەتی مرۆڤەكان ...

ئەگەر حاڵەکە بەم جۆرە بێت ئەوە دوور نییە دەسەڵاتی داگیرکەر یان شیوعیەت جارێکی تر تاکەکەس یان خێزان یان لادێ یان نەتەوە بکەنەوە بە کۆیلە، بۆ ئەوەی لەبەرامبەر پارە یان بەرژەوەندیدا هەمویان لەبازاڕی تازەی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەکاندا بفرۆشن... سەرشۆڕیان دەکەن و دەیانکەن بەکۆیلە!!

لەبەر ئەم هۆکارەیە ئیسلام بە تەواوەتی و بە دەقێکی ڕوون و ئاشکرا و یەکلاکەرەوە بەکۆیلەکردنی هەڵنەوەشاندۆتەوە..

## هۆکاری ڕامیاری:

وەك باسکرا ئیسلام دەسەڵاتی ڕەهای داوە بە گەورەی موسڵمانان لەوەدا کە لە هەمبەر مامەڵەکردنی دیلی جەنگدا یەکێك لەم چوار حاڵەتە هەڵبژێرێت: لە ئازاد کردنی بە منەت، یان بە بریتی، یان کوشتنی، یان بە کۆیلە کردن.

گومانی تێدا نییە کاتێك پێشەوای موسڵمانان بە چاوی دانایی و بەرژەوەندیەوە دەڕوانێتە کارەکە و بەدیدێکی سیاسی قوڵی گشتگیرەوە تەماشای دۆزەکە دەکات... بۆ ئەوەی لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵە لەگەڵ دیلدا بکات.... ئەوە هەر دەبێت لەکۆتاییدا بگاتە سەلامەت ترین چارەسەر.

دوور نیە کە حوکمی کوشتن بدرێت بەسەر دیلدا ئەگەر بینی دۆخی موسوڵمانان لاوازو شلۆقە، دووریش نیە حوکمی ئازادکردنی بدرێت لەسەر بنەمای منەت و بێ بەرامبەر یان بەرامبەر بە بڕە پارەیەك، ئەگەر بینی دۆخی موسوڵمانان بەهێزو تۆکمەیە، هەروەك

دوور نیە لەسەر بنەمای بە کۆیلەکردن مامەڵە بکرێت لەگەڵ دیلدا ئەگەر هاتوو دوژمن دیلی موسڵمان بکاتە کۆیلە، ئەمەش لەسەر بنەمای مامەڵەکردنی هاوشێوە.

ئابەم شێوەیە پێشەوا و گەورەی موسڵمانان ئەو شتە دەکات کە بەرژەوەندیەکی رامیاری، یان پێویستیەکی جەنگی، یان دارایی تێدابێت. ئیتر چۆن ئیسلام لە رێگای دەقێکی روونی یەکلا کەرەوەوە بەیەکجاری کۆیلەیەتی قەدەغە دەکات، کە ئەگەری بەکۆیلەکردنی دیلی جەنگ لەلایەن دووژمنانەوە گومانی تێدا نیە و ئاماژەکانی ئەم ئەگەرەیش شتێکی چاوەڕوان کراوە؟!!!



## هۆکاری دەروونی :

لە باسێکی پێشوودا ئەوەمان روون کردەوە کە ئیسلام کاتێك بەرنامەیەکی تەواوی دارِشت لەبواری رەفتارو جوان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کۆیلە و بەرزکردنەوەی ئاستی رەوشتیی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤانەیان. ئامانجی ئەوەبوو کە کۆیلە هەست بە رِێزو کەرامەت و بوونی مرۆڤانەی خۆی بکات، بۆ ئەوەی دواتر داوای ئەوە بکات لە کۆیلەبوون رزگاری بێت و لە کۆتاییشدا ئازادی تەواوەتی خۆی بەدەست بهێنێت.

هەروەها پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەیش کرد کە ئیسلام پێش ئەوەی کۆیلەکان لە جیهانی واقعدا ئازاد بکات، لە ناخی خۆیان و قوڵایی ویژدانیانەوە ئازادی کردن، تاوەکو هەست بە رِێزو بوونی خۆیان بکەن و، خۆیان داوای ئازادی بکەن، کاتێکیش ئەم داوایە دەکەن دەبینن

شەریعەتی ئیسلامی باشترین پاڵپشتی کاری ئەم ئازادیەیانە، باشترین چاودێرە بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانیان، لە بابەتی ئازادکردنی کۆیلە بە موکاتەبەدا ئەمەمان بەوردی ڕوون کردەوە.

وەك لە پێشەوە باسمان کرد تەنها دەرکردنی بڕیارێك نەدەبووە هۆی رزگارکردنی کۆیلەکان، ئەزموونی ئەمریکا لە ئازادکردنی کۆیلەکاندا لەڕێگای ئیمزایەکی ئەبراهام لینکۆڵنەوە باشترین بەڵگەی ئەم قسەیەمانە، ئەو کۆیلانەی کە لنکۆڵن لە ڕێگای دەرکردنی یاساوە ئازادی کردن بەرگەی ئازادییان نەگرت و هەر زوو گەڕانەوە بۆلای گەورەکانیان و تکایان لێدەکردن وەك جاران بەکۆیلەی خۆیان وەریان بگرنەوە، چونکە ئەم کۆیلانە بەر لەوەی لە ناخەوە ئازاد ببنو هەست بە تام و چێژی مرۆڤبوون و کەرامەتی مرۆڤایەتی بکەن، لە پڕێکدا ئازاد کران.

لە کاتێکدا ئیسلام جیاوازی زۆرە لەگەڵ هەموو سیتمە کۆمەڵایەتیەکانی تردا لە شێوازی مامەڵە کردنی لەگەڵ کۆیلەدا، ئاینی ئیسلام ـ وەك ئاماژەی پێکرا ـ کاتێکیش کە کۆیلەن هەر مامەڵەیەکی مرۆڤانەی لێبوردانەیان لەگەڵدا دەکات، بۆ ئەوەی کاتێك تامی ئەم مامەڵەیەی کردوو هەستی پێکرد، ئەوکاتە لەژێر سایەی یاسای ئیسلامدا داوای ئازادبوونی خۆی بکاتو وەك بەڕێزترین مرۆڤ و خاوەنی باشترین ڕێزو کیانی مرۆڤانەو، بەهەست و ویژدانێکی بەرزەوە لەو بازنەی کۆیلایەتیە بچێتە دەرەوە.

لێرەوە حیکمەت و دانایی ئیسلام دەردەکەوێت لەوەدا کە بۆچی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێ کۆیلەکانی ئازاد نەکردووە و لەبازنەی کۆیلایەتیدا هێشتونیەتەوە، تا کاتێك کە هەست بە بوون و کیانی خۆیان دەکەن و ئینجا

کەی ویستیان و بەگونجاویان زانی لە ڕێگای موکاتەبەوە داوای ئازادی بۆ خۆیان دەکەن.

لەبەر ئەم ئیعتیبارەیە کە ئیسلام کۆیلایەتی بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە قەدەغە نەکردووە.

## هۆکاری کۆمەڵایەتی:

لەوانەیە هەندێك جار هەبوونی کۆیلە بەرژەوەندیەکی کۆمەڵایەتی گەورەی تێدابێت، وەك ئەوەی هەبوونی کۆیلە هۆکارێکە بۆ پاك کردنەوەی کۆمەڵگە لە حاڵەتی بێسەروبەرەیی بەرەڵآیی و داوێن پیسیو ئەو ڕەوتانەی بانگەشە دەکەن بۆ لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە، جا لەم حاڵەتەدا هەرکەس توانای ئەوەی نەبێت بەهۆی زۆری مارەییەکەیەوە ژنێکی ئازاد مارە بکات دێت کەنیزەکێك مارە دەکات و لەڕێگای حەڵاڵەوە حەزی سێکسی خۆی تێر دەکات و بە هۆی ئەو کەنیزەکەوە خۆی لە زینا و داوێن پیسی دەپارێزێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: [وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ] ألى ان يقول [وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا] النساء : ٢٥ ـ ٢٧

واتە: {وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هەژاری ئافرەتی ئازادی ئیماندار مارە بکات ئەوە با لەوانە مارە بکات کە بونەتە موڵکتان لە

کەنیزەکە ئیماندارەکانتان........لەبەر ئەوە مارەیان بکەن بە ڕەزامەندی خاوەنەکانیان و مارەییەکەیان پێ بدەن بە شێوازێکی چاك} هەتا وەکو {بەڵام ئەوانەی کە شوێن ئارەزووات کەوتوون دەیانەوێت لاتان بدەن بە لادانێکی گەورە}

لە زۆرێك لە فەرمانگەکاندا کۆمەڵگە پێویستی بە ئافرەتی دانەپۆشراوە، کەنیزەکیش لەم پۆلەن، چونکە ئیسلام پێویستی نەکردووە لەسەر کەنیزەك وەك ئافرەتی موسوڵمانی ئازاد بەتەواوی خۆی داپۆشێت، بەڵکو لە دیدی شەریعەتەوە تەنها ئەوەندە بەسە کە لە سنگیەوە هەتا خوار ئەژنۆی داپۆشێت، تەنها کاتێك نەبێت کە ئەم دانەپۆشراویەی مەترسی ئەوەی لێ بکرێت کە ببێتە مایەی فیتنە، لەم کاتەدا و بۆ ڕێگرتن لەوەی خەڵکی بەهۆی دانەپۆشراویەکەیەوە بکەونە ناو تاوانەوە ناچار دەکرێت بە تەواوی خۆی داپۆشێت.

هەندێك جاریش بە کۆیلەکردنی ئافرەت لە جەنگەکاندا چارەسەرێکی سەرکەوتووە بۆ پاراستن و سەرپەرشتی کردنی و ڕێز گرتن لە مرۆڤبوونەکەی، چونکە زۆربەی کات دوای کۆتایی هاتنی جەنگ ئەو کەسەی هەڵدەستێ بە سەرپەرشتی کردنی وەك مێردی یان برای[1] سەرپەرشتی دەکات، چونکە

---

(١) مەبەست لە مێرد ئەوەیە ئەو ئافرەتە لەلایەن گەورەکەیەوە مارە دەکرێ یان هەر بە چونە لای و دروست بوونی منداڵ ئەو ئافرەتە دەبێتە خێزانی گەورەکەی و مامەڵەی خێزان و منداڵەکەش مامەڵەی منداڵی شەرعی لەگەڵ دەکرێت، مەبەستیش لە برا ئەوەیە ئەو ئافرەتە دەکەوێتە لای موسڵمانێك کە بە هیچ جۆرێك ئازاری نادات و بە کاری ناهێنێت بۆ کاری بەدڕەوشتی وەك خوای گەورە دەفەرموێ: [وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ ] واتە زۆر مەکەن لە کەنیزەکەکانتان کە داوێن پیسی بکەن ئەم ئەمرە بڕاوەتەوە و هەرکەس بیکات پێچەوانەی ئیسلامی کردووە .وەرگێر

ئازادکردنی دەبێتە هۆی فەوتان و تیاچوونی[١].

ئاشکرایە کە بە کۆیلە کردنی ئافرەت لە ژێر سێبەری سیستمی ئیسلامیدا تەنها دەیکاتە موڵکی خاوەنەکەیی و بۆ کەسی تر نیە سەرجێی بکات لەگەڵی، هەموو مافێکی ئەوەشی هەیە بە موکاتەبە خۆی ئازاد بکات، بە بوونی منداڵێکیش لە گەورەکەی ڕاستەوخۆ دوای مردنی گەورەکەی ئازاد دەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە لەماڵی گەورەکەیدا سەرپەرشتی و چاودێری و مامەڵەی جوانی لەگەڵ دەکرێت، هەوەك ئیسلام فەرمانی پێ کردووە.

لە کاتێکدا بە کۆیلەکردنی ئافرەت لە وڵاتانی نا موسڵماندا شەرەف و ناموسی پێشێل دەکرێت،[٢] و هەرکەس بیەوێت دەچێتە لایان و داوێن پیسیان لەگەڵدا دەکات. ئەمە جگە لەو مامەڵە خراپ و سوکایەتیە ئاشکرایەی کە پێیان دەکرێت!

کەواتە بە کۆیلە کردن هەندێك جار بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و هۆکاری ڕەوشتی و دەستگیرۆیی مرۆڤانەی تێدایە... کە جگە لە ژیرو هۆشیارەکان کەسی تر لێی تێناگات... لەبەر ئەم هۆکارەیشە کە ئیسلام بە تەواوەتی کۆیلایەتی هەڵنەوەشاندۆتەوە .

---

(١) چونکە ئەو ئافرەتە کە دیلە کەسی نی یە و ئەگەر کەسێك سەرپەرشتی نەکات و لای خۆی نەیهێڵێتەوە بێ گومان بە دەست مرۆڤە خراپەکانەوە تووشی خراپەو فەوتان دەبێت .. وەرگێر

(٢) ئێستاو لەم سەدەی بیست و یەکە کە مافی مرۆڤ بانگەشە و فووی زۆر تێدەکرێت بە هەزارەها ئافرەت لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو ئەفریقیاوە لەلایەن باندە مافیاییەکانەوە دەبرێن بۆ ئەوروپا و پاسپۆرتیان لێدەسێنرێت و بەزۆر لە شوینە بەدڕەوشتیەکاندا کاری لەشفرۆشیان پێدەکرێت و لەلایەن حکومەتیشەوە هیچ ڕێو شوێنێك ناگیرێتە بەر بۆ ئازادکردنیان ..وەرگێر

## هۆكاری یاسایی:

ئەمەش لای هیچ مرۆڤێكی ژیر شاراوە نیە، كە كۆتایی هێنانی كۆیلایەتی لە ئیسلامدا بەشێوەیەكی كوتوپڕ نەبووە، هەروەها دەقێكی یەكلاكەرەوەیش لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە كە ڕاستەوخۆ حەرامی بكات، بەڵكو بە شێوەی پلەبەندی یاسایی و، كاتبەندی بووە، كە بە قۆناغێك كۆتایی دێت لە هەڵوەشاندنەوەی كۆیلایەتی دەچێت، بەڵام بێ دروستكردنی ئاژاوە یان خولقاندنی تەنگ و چەڵەمە.

ئەمە چۆن بووە؟

وەك باسمان كرد، كاتێك باسی ڕۆڵی ئیعتیباراتە جیهانیەكانمان كرد لە هەڵنەوەشاندنەوەی كۆیلایەتی لە لایەن ئیسلامەوە، ئاماژەمان بەوەدا كە كاتێك ئیسلام هات لە هەموو سیستەمە جیهانیەكاندا كۆیلایەتی بەیاسا كرابوو، تەنانەت داراوێكی ئابووری و پێویستیەكی كۆمەڵایەتی‌ش بوو. هەر لەوێدا ئاماژەمان كرد بەوەی كە گۆڕینی ئەم سیستەمە یان تەواو كەنارخستن و سڕینەوەی هەروا كارێكی ئاسان نەبوو، بەڵكو پێویستی بە ماوەیەكی درێژ هەیە.

**ئەم پلە بەندییە چۆن بوو؟**

١ـ ئیسلام هات هەموو ئەو سەرچاوانەی كۆیلەكردنی وشك كرد كە لە جیهاندا هەبوون، جگە لە بەكۆیلەكردنی دیلی جەنگ.

ـ ئەو سەرچاوانەی بە كۆیلەكردنی وشك كرد، كە بەهۆی تێركردنی ئارەزووی سێكسی و مژینی خوێنی گەلانەوە دەكران.

ASTANA

ـ ئەو سەرچاوانەی بە کۆیلەکردنی وشك کرد کە پەیوەندیان هەبوو بە هەژاری یان نەبوونی توانای دانەوەی قەرز.

ـ وشك کردنی سەرچاوەی کۆیلەیەتی کە بەهۆی میراتی بوون بۆ خاوەنەکەی ماوەتەوە، ئەمەش تایبەت بووە بە ڕەگەزێکی دیاری کراوو سروشتێکی دیاریکراو .

ـ وشك کردنی سەرچاوەی کۆیلایەتی بەهۆی کارکردن لە زەوی و مانەوە تیایدا.

ـ وشك کردنی سەرچاوەی کۆیلایەتی بەهۆی هەڵسوکەوتی نەشیاو بەرامبەر چینی گەورەو ڕێزدارەکان.

ئەم سەرچاوانەو هاوشێوەکانیان، کە لەو کاتەدا لە جیهاندا هەبووە، ئیسلام هات و وشکی کردن.

٢ـ ئیسلام مەرجی داناوە بۆ ئەو شەڕو جەنگەی کە دیلەکان تیایدا دەکرێت بە کۆیلە و دەبێت جەنگێکی شەرعی بێت، لەوەو پێش باسی خەسڵەتەکانی ئەو جەنگە ڕەوایەمان کردووە کە دەکرێتە بیانوی بەکۆیلە کردنی دیلی جەنگ.

٣ـ ئاینی ئیسلام دەسەڵاتێکی فراوانی داوە بە پێشەوای موسڵمانان لە چۆنێتی مامەڵەکردنی لەگەڵ دیلی جەنگدا دوای کۆتایی هاتنی جەنگ و هەڵبژاردنی ئەو شتەی بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدایە، سەرپشکی کردووە لە هەڵبژاردنی یەکێك لەم ڕێگایانە: ئازادکردن بە منەت و بێ وەرگرتنی بەرامبەر، یان بە بریتی، یان کوشتن، یان کۆیلە کردن، خۆ ئەگەر پێی باش بوو لەسەر بنەمای واژۆکردنی پەیماننایەکی

نێودەوڵەتی چاوپۆشی بکات لە بەکۆیلەکردنی دیلی جەنگ ئەوە دەتوانێت ئەوکارە بکات، هەروەك چۆن محمد الفاتح کردی.

٤ـ لە حاڵەتی بوونی کۆیلەدا، ئیسلام ئەوەندە دەرگای کردۆتەوە بەڕووی ئازادکردنی کۆیلەدا، کە زامنی کۆتایی پێهێنانی کۆیلایەتی دەکات لە ماوەیەکی کاتیدا، کە لەوانەیە کورت یان درێژبێت.

پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە ئیسلام بەرنامەیەکی تەواو یان ڕوونتر بڵێین دەرگای زۆری کردۆتەوە بە ڕووی ئازادکردنی کۆیلەدا.

لە بەرەنجامی ئەمەیشەوە کۆیلایەتی بوونی نەما لە کۆمەڵگاکاندا، ئیسلامیش لە ڕێی ئەو بەرنامەیەی هێنای بۆ ئازادکردنی کۆیلە بووە پێشەنگ و نمونەیەکی جوانی وڵاتان، نەك هەر ئەوە بەڵکو بە حەوت سەدە کەوتە پێش وڵاتانی ترەوە لە ئازادکردنی کۆیلەدا.

## پوختەی قسە:

ئیسلام نەهاتووە بەشێوەیەکی کت وپڕ لەڕێگای دەقێکی یەکلاکەرەوەوە کۆیلایەتی هەڵوەشێنێتەوە، بەڵکو هات تەنگی بەسەرچاوەکانی دروستبوونی کۆیلایەتی هەڵچنی و وشکی کردن و چەندین دەرگای بەڕووی ئازادکردنیاندا کردەوە، پاشان دەسەڵاتی بڕیاردان لەبارەی هێشتنەوەی یان کۆتایی پێ هێنانی یەکجارەکی لە داهاتوودا داوەتە دەست پێشەوای موسوڵمان، ئەویش لەسەر بنەمای مامەڵەکردنی هاوشێوە یان پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی... لەژێر ڕۆشنایی ئەو دەسەڵاتانەی شەرع بۆی دیاری کردووە هەرشتێك بەرژەوەندی تێدابوو ئەوە دەکات.

ئەم پلەبەندییە لە کۆتایی پێهێنانی کۆیلایەتی هیچ نیە جگە لە پیشاندانی گەورەیی شەریعەتی ئیسلامی نەبێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان

و ڕونکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی ئەم ئایینە خواییە لە ڕووی تایبەتمەندیەکانی و گشتگیریی و جیهانی بوونی بە درێژایی کات و رۆژەکان!!.

**دەی جگە لەمە ئیتر باوەڕ بەچی دەهێنن؟**

دوای ئەم ڕونکردنەوەیەو خستنەڕووی راستیانە، زانیت - برای خوێنەر - کە بەهۆی هۆکاری جیهانی و رامیاری و دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاساییەوە بووە کە ئیسلام یەکجاری سەرچاوەی بە کۆیلە کردنی دیلی جەنگی بنەبڕ نەکردووە.

ئەم هۆکارانەیش هەموویان جەخت لەوە دەکەنەوە کە خوای گەورە لەو یاساو بڕیارانەی بۆ مرۆڤی دەنێرێت باشتر ئاگادارە بە راستیەکانی ناخی مرۆڤ و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان و گۆڕانکارییە سیاسیەکان و حیکمەتی یاسادانان و دۆخی نەتەوەکان... هەروەها ئەو باشتر دەزانێت کە پوچەڵ کردنەوەی ئەم سیستمی کۆیلایەتیە یان گۆڕینی پەیوەستە بە کامیانەوە: کات، یاخود پێویستیەکی دەستبەجێی خێرا!!

جا ئەگەر خوای گەورە بیزانیایە حەرام کردنی مەشروبات و عارەق تەنها بە دەرکردنی یاسایەك جێ بەجێ دەبێت و موسڵمانان دەستی لێ هەڵدەگرن، ئەوە بە چەند ساڵێك حەرامی نەدەکرد، هەروەها ئەگەر بیشیزانیایە کە هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی تەنها پێویستی بە دەرکردنی یاسایەکە بۆ ئەوەی دەستبەجێ کۆتایی پێ بهێنرێت، ئەوە لەسەری نەدەوەستاو راستەوخۆ هەڵی دەوەشاندەوە.

بەڵام خوای گەورە دەزانێت و ئێوە نازانن ... خوای دەفەرموێت [أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ] الملك : ١٤

واتە: ئایا ئەو خوایە کە مەردوومی دروست کردووە ئاگای لە نهێنیان نیە لە کاتێکدا ئەو وردبین و ئاگادارە.

## ئایا لە جیهانی ئەمڕۆدا کۆیلەیەتی بوونی هەیە؟

راستە کە شۆڕشی فەرەنسی کۆیلایەتی لە ئەوروپا هەڵوەشاندەوە، ئەوەیش راستە کە لنکۆڵن لە ئەمریکا کۆیلایەتی هەڵوەشاندەوە، دوای ئەوەیش جیهان لەسەر هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی رێکەوتن!!

ڕاستە هەموو ئەمانە ڕوویاندا، بەڵام پێویستە بە ناوو دروشمی باق و بریق فریو نەخۆین... ئەگەرنا، ئەو کۆیلایەتیەیەی هەڵوەشێنراوەتەوە کامەیە؟ ئەوەی ئەمڕۆ لە هەموو جیهاندا ڕوودەدات دەکرێت ناوی بنێین چی؟ ئەوەی فەڕەنسا لە وڵاتی مەغریبی موسوڵماندا کردی ناوی لێ بنرێت چی؟ ئەوە ناو دەنێیت چی کە ئەمریکا لە گەڵ رەش پێستەکاندا کردی، ئەوەی ئینگلتەرا کردی لەگەڵ رەش پیستەکانی باشوری ئەفەریقا، ئەوەی ڕووسیا کردی لەگەڵ ئەو وڵاتە ئیسلامیانەی کە لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون؟

ئایا کۆیلایەتی لە حەقیقەتدا - وەك محمد قوتب دەڵێت - بریتی نیە لە پاشکۆیەتی نەتەوەیەك بۆ نەتەوەیەکی تر؟ بێبەش کردنی گرووپێك مرۆڤ نییە لە مافە ڕەواکانی لە پێناو گرووپێکی تردا؟ یاخود شتێکی تری جیاواز لەمەیە؟

ئەمەی وتمان لەژێر ناونیشانی کۆیلایەتیدا بێت، یان لەژێر ناونیشانی ئازادی و برایەتی و یەکسانیدا بێت چی جیاوازییەکی هەیە؟ ناونیشانی باق و بریق چی سودێکی هەیە ئەگەر ئەو راستیانەی لەپشتیانەوەیە پیس ترین و ناشرینترین شت بن کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیبێتی؟

ASTANA

بەڕاستی ئیسلام ڕاشکاوبوو لەگەڵ خۆی و خەڵکیشدا کاتێك وتی: ئەمە کۆیلایەتیە و تاکە هۆکاریشی ئەمەیە، ڕێگای دەربازبوون لێیشی کراوەیە، هەروەها ئەگەر پێویستیشی کرد ڕێگای کۆتایی پێهێنانیشی هەیە، بەڵام ئەم شارستانیەتە پووچ و درۆیینەی کە ئەمڕۆ لە سایەیدا دەژین ئەم ڕاشکاویەی تێدا نییە، لێهاتوویی و شارەزاییەکەی لە ساختەکردنی ڕاستیەکاندا بەخەرج دەدات، هەر خەریکی بۆیاخ کردنی دروشمە بریقەدارەکانە!!

کوشتنی سەدان هەزار کەس لە تونس و مەغریب و جەزائیر و مەراکیش... لەبەر هیچ نەبوو ئەوە نەبێت کە داوای ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیی و ڕێزی مرۆڤایەتیان دەکرد!!

کوشتنی سەدان هەزار مرۆڤ لە ئەفریقا لەپێناوی هەمان مەبەستدا، بۆئەوەی لە وڵاتەکانی خۆیاندا گەورەو ڕێزدارانە بژین، پەیڕەوی بیروباوەڕی خۆیان بکەن و بەزمانی خۆیان قسە بکەنو خزمەتکاریی خۆیان نەبێت هی کەسی تر نەکەن!!

کوشتنی سەدان هەزار موسڵمانی ڕووسیا لەبەر ئەوەی رازی نەبوون بە ملکەچکردن بۆ بیروباوەڕی بێباوەڕی روسیا و سیستمی مارکسیەت... کوشتنی ئەو بێ تاوانانە و زیندانی کردنیان لە شوێنی قێزەوندا بەبێ نان و ئاو و هەتك کردنی شەرەف و ناموسیان، هەڵکوتانە سەر ئافرەتەکانیان و کوشتنیان بە ڕووتی، هەڵدڕینی سکیان و گرەوکردن لەسەر جۆری کۆرپەلەکەی ناو سکیان!!

لەسەدەی بیست و یەکدا ئەمە ناو دەنێن شارستانیەت و مەدەنیەت، ئەویش لە ژێر دروشمی درۆییندا: ئازادی، برایەتی، یەکسانی...

ئێمەیش ناوی دەنێین بەندایەتی و ستەم و بەکۆیلەکردن لەجۆرو فۆرمێکی نوێدا.

بەڵام ئەو مامەڵە بێ وێنە نمونەییەی کە بەر لە سیازدە سەدە و لە ڕوانگەی باوەڕ پێ بوون و ڕێزگرتن لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی ئیسلام بەخشی بە کۆیلە... لە دیدی - قین لەدڵەکانەوە - دواکەتوویی و دارِمان و دڕندەییە.

ئەو کاتەی ئەمریکیەکان لە سەر دیواری ئوتێل و چێشتخانەکانیان لافیتەیان هەڵدەواسی و لێیان دەنوسی: (هاتنە ژوورەوە تەنها بۆ سپی پێستە)، یاخود بە دەستەواژەیەکی پیس و گڵاوتر دەنوسرا: هاتنە ژوورەوەی ڕەش پێست و سەگ قەدەغەیە.

کاتێك کۆمەڵێك سپی پێست بە پێڵاوەکانیان لە پیاوێکی ڕەش پێست دەدەن تا ڕۆحی دەردەچێت، کابرای پۆلیسیش بەدیاریانەوە راوەستاوەو تەماشایان دەکات و هیچ جوڵەیەك ناکات بۆ ئەوەی لەژێر دەستیان دەری بهێنێت، گوێ نادات بە برا دینی یان نیشتیمانی یان هاوزمانەکەی... تەنها لەبەر ئەوەی ئەم رەش پێستە جورئەتی ئەوەی کردووە بەلای ئافرەتێکی ئەمریکی سپی پێستی بێ رەوشتدا بڕوات... ئەمە ئەوپەڕی شارستانیەت و پێشکەوتنە کە سەدەی بیست و یەك پێی گەشتووە!!

چیرۆکی ڕەش پێستەکانی ئەفریقیا و بێ بەشکردنیان لە مافەکانیانو کوشتن یان وەکو ڕۆژنامە ئینگلیزیە بۆگەنەکان دەڵێن: (ڕاوکردنیان)، چونکە جورئەتیان کردووەو هەستیان بە کەرامەتی خۆیان کردووەو، داوای ئازادیان بۆ خۆیان کردووە... ئا ئەمە لوتکەی دادگەری بەریتانیایە.

ASTANA

ـ ئەمە و با ئەوەیش لەولاوە بوەستێت کە وڵاتانی شیوعی چۆن ئەندامانی گەلەکەی خۆیان کردووە بە کۆیلە، یاخود چۆن موسوڵمانانی ژێر دەسەڵات و قەڵەمڕەوی خۆیانیان کردووە بە کۆیلە، ئەمەش مۆرێکی ڕەشە بە ناوچەوانی مرۆڤایەتیەوە، بەڵکو بریتیە لە دڕەندەیی و بەکۆیلەکردن و خۆسەپاندنێك کە لەمێژوودا وێنەی نەبووە.

پرسیار بکەن لەبارەی ئەم دڕەندەیی و بەکۆیلەکردن و خۆسەپاندنەوە... لەبارەی چاڵە بەکۆمەڵەکانی کوشتن، لافاوی خوێن... لەو وڵاتانەی کە شیوعیەت دەستی بەسەردا گرتوون.

ـ ڕووسیا و چینی شیوعی نزیکەی شازدە ملیۆن موسوڵمانیان لەناوبرد، واتە بە تێکرا هەر ساڵەی یەك ملیۆن موسوڵمانیان لەناو بردووە.

ـ یوغسلافیای ئیشتراکی بەتوندترین شێوە کەوتە سزادان و چەوساندنەوەی موسوڵمانان، بەجۆرێك لەو کاتەوەی کە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە سیستەمەکەی گۆڕا بۆ شیوعیەتی ئیشتراکی هەتا ئێستا یەك ملیۆن کەسی لێ لەناوبردوون، ئەم پرۆسەی سزادان و لەناوبردنە بێڕەحمانەیان هەتاوەکو ئەم ساتانەی قسەی تێدا دەکەین هەر بەردەوامە[١].

ـ لە ئێستادا ئەوەی لە یوغسلافیا ڕوودەدات لە گشت دەوڵەتە شیوعیەکانی تریشدا هەمان شت ڕوودەدات.

---

(١) دیارە لەو کاتەی نوسەر ئەم بابەتەی نوسیوە دەوڵەتی یوغسلافیای شیوعی بوونی هەبووە و پارچە پارچە نەبووە. وەرگێڕ

ـ چەندجار گوێبیستی ئەو قەسابخانە پڕ لەئازارانە بووین کە لەیەمەنی باشور لەلایەن شیوعیەکانەوە ئەنجام دراون، بەهەمان شێوە لە ئێستای ئەفغانستاندا، لەهەر شوێنێکی جیهاندا کە هێزو دەسەڵاتیان هەیە ئەمە کارووپیشەیانە بەرامبەر موسوڵمانان.

ـ لە ڕابردوودا چەندین جار گوێبیستی خوێن ڕێژیەکانی شیوعیەت بووین لە عێراقدا، چەندین جار ئەو تاوان و کوشتارانەمان بەرگوێ کەوتووە کە لە شاری موصڵ و لەسەردەمی عبدالکریم قاسمدا روویان داوە، چەندین جار رووداوەکانی گرتن و زیندانی کردن و کوشتن و شێواندنی تەرمی بانگخوازانی باوەڕداری ئەو سەردەمەمان کەوتۆتە بەرگوێ.

ـ خوای گەورە دەفەرموێت [وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ] البروج ٨ .

واتە: هیچ تاوانێکیان نەبوو ئەوە نەبێت ئەیان وت خوامان الله یە! هیچ گوناهێکیان نەکردبوو ئەوە نەبێت کە دەیان وت: بنەماکانی بێباوەڕی و سیستمە دژە ئایینەکانمان قبوڵ نییە، بۆیە ئەوە چارەنوس و پاداشتیان بوو!!

چەند جێگەی تێڕامان و سەرسوڕمانە ئەم گووتەیە هەندێکیان دەیان وت:

قتل امريء في غابة جريمة لاتغتفر
وقتل شعب آمن مسألة فيها نظر

واتە: کوشتنی کەسێك لە دارستانێکدا تاوانێکە لێ بوردنی نییە
بەڵام کوشتنی گەلێکی بێوەی پرسێکەو دەبێت لێی وردبینەوە و خێرا بڕیاری تێدا نەدەین

ئەمە سەبارەت بە کۆیلەکردنی بیر وباوەڕ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کۆیلەکردنی ئازادی و ئیرادەوە هەیە ئەوە بەبێ هیچ لەڕوو دامانێك باسی بکە.

ئەو مرۆڤەی لە هەر شوێنێکی دنیادا لە ژێر سایەی حوکمی شیوعیەتدا دەژی، ئازاد نییە، نە لەهەڵبژاردنی جۆری ئەو کارەی خۆی دەیەوێت، نە لە هەڵبژاردنی ئەو شوێنەی کاری تێدا دەکات، نە مافی ئەوەیشی هەیە راوبۆچوونی خۆی دەربڕێت، نە بۆیشی هەیە رەخنە لە هیچ کەموکوڕیەك بگرێت، بۆیان نەبوو رەخنە بگرن لە هیچ سیستمێکی خراپ، مافیان نەبوو ببنە خاوەنی هیچ شتێك، نەیان دەتوانی گەشت بکەن، تەنانەت نەیان دەتوانی بڵێن: بۆچی؟ کەواتە ئەوانە کۆیلەیەکی دەستوپێ بەستراون، نە ئازادیان هەیەو نە مافی هەڵبژاردن و نە ئیرادەیشیان هەیە.

خۆ ئەگەر دەسەڵات هەستی بکردایە کەسێك بە ئاماژەیەك یان قسەیەك یان کردەوەیەك رەخنەی لە بارودۆخەکە گرتووە... ئەوە بە دڵنیاییەوە چارەنوسی یان کوشتن دەبوو یان زیندانی دەبوو یان دوورخستنەوەی دەبوو بۆ سیبیریا!!

ئەمانە چەند شێوازێکی کۆیلایەتی روون و ئاشکران کە بەزمانی حاڵ هاوار دەکەن و لە ئێستای دنیادا بەناوی مەدەنیەت و پێشکەوتن و بنەماکانی شۆڕشگێڕییەوە روودەدەن... هەر ئەم جۆرانەی کۆیلایەتیشە کە میللەتانی بێبەش کردووە لە داواکردنی مافەکانی و ناچاری کردووە ببێتە پاشکۆی خۆی و بەزۆری ئاگر و ئاسن زۆری لێ کردووە رازی بێت بەم شێوازە تازەیەی کۆیلایەتی و ملکەچ بێت بۆ هێزو دەسەڵاتی ئەو!!

کەواتە پێویستە لەسەرمان فریو نەخۆین بە دروشم و ناو، چونکە تا ئێستا کۆیلایەتی لە جیهانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا هەڵ نەوەشاوەتەوە، بەڵکو شکڵێکی تازە و ڕێگایەکی تازە و شێوازێکی نوێی وەرگرتووەو هیچی تر [ولكن أكثر الناس لا يعلمون] سورەتی یوسف ٢١. واتە: بەڵام زۆرینەی خەڵکی نازانن ..

## ئەی بە کۆیلەکردنی کەنیزەك چی؟

ئەوەی لای هەموان ڕوونە لەبارەی سیستمی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام ڕێگەی بە گەورە و خاوەنی کۆیلە داوە کە چەند دانەیەك لە کەنیزەکی شەرعی هەبێت، تەنها خۆی لەزەت و چێژیان لێ ببات، ئەگەر ویستی لێ بوو لێیشیان مارە دەکات، وە قورئانی پیرۆزیش دانی بەم حاڵەتەدا ناوە کاتێك فەرمویەتی:

[وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَـٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ] المؤمنون ٥ - ٦

واتە: وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیان (لە شەرواڵ پیسی)، مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ کەنیزەکێك کە بوون بە خاوەنیان ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن.

هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناس یان ڕۆژئاواپەرست یان بێ دینانەی کە دڵیان نەخۆشە دەڵێن: چۆن ئیسلام ڕێگە دەدات بە سیستمی کەنیزەك؟ چۆن بواری بۆ پیاو ڕەخساندووە کە خۆی خاڵی بکاتەوە لە ژمارەیەك ئافرەتدا، بە مەبەستی چێژوەرگرتن و تێرکردنی شەهوەتی؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم گومانە بدەمەوە کە دووژمنانی ئیسلام لەبارەی سیستمی کەنیزەکەوە دەی وروژێنن، دەمەوێت ئەم دوو ڕاستیە ڕوون بکەمەوە:

ASTANA

١ ـ دروست نیە و حەرامە هیچ موسڵمانێك بچێتە لای هیچ دیلێكی ئافرەت كە لە جەنگدا دیل كراون، تاوەكو لەلایەن قازی موسڵمانانەوە بڕیار لەسەر بەكۆیلەكردنیان دەدرێت.

٢ ـ دروست نیە و حەرامە بۆ هیچ موسڵمانێك بچێتە لای هیچ دیلێكی ئافرەت دوای بە كۆیلە كردنیشی، تاوەكو نەبێتە كەنیزەك(ملك یمین)ی خۆی.

لە دوو حاڵەتیشدا نەبێت ئافرەتانی دیلی جەنگ نابنە كەنیزەكی موسڵمان:

**یەكەم:** دەبێت ئەو ئافرەتە پشكی ئەو موسڵمانە بێت لە دەستكەوتی جەنگەكە.

**دووەم:** ئەگەر هی كەسێكی تر بوو دەبێت لێی بكڕێتەوە.

دوای ئەوەیشی كە دەبێتە هی ئەو بۆی دروست نییە دەستی بۆ بەرێت تاوەكو لە بێ نوێژی (حیض) پاك دەبێتەوە، ئەمەیش بۆ دڵنیابوونە لەوەی كە دووگیان نییە، پاشان كەی ویستی لێ بوو وەك خێزانەكانی خۆی دەچێتە لای.

دوای ڕوونكردنەوەی ئەم ڕاستیانە، ئێستا وەڵامی ئەو گومانانە دەدەینەوە كە دوژمنانی ئیسلام دەی وروژێنن سەبارەت بە كەنیزەك إن شاءالله:

پێشتر باسی ئەوەمان كرد كاتێك ئافرەتێك دەبێتە كەنیزەكی موسڵمانێك ئەوا دروستە بۆ خاوەنەكەی هەروەك خێزانی خۆی سەرجێیی لەگەڵدا بكات، جا ئەگەر منداڵێكی لێی بوو ئەوا لە ڕوانگەی شەرعەوە دەبێتە دایكی منداڵ، لەم كاتەشدا حەرامە بۆ خاوەنەكەی كە بیفرۆشێت، خۆ

ئەگەر پیاوەکە مردو ئازادی نەکردبوو ئەوا ڕاستەوخۆ پاش مردنی گەورەکەی ئازاد دەبێت، هەروەها ئەو مافەشی هەیە کە داوای ئازادی خۆی بکات بە سیستمی موکاتەبە، ئەوکاتەش دەبێتە مرۆڤێکی ئازاد.

کەواتە ئیسلام کاتێك سیستمی کەنیزەکی بۆ گەورەکەی حەڵاڵ کردووە، بەم کارەی ویستویەتی چاکەیان لەگەڵدا بکات و لە کۆیلایەتی و دەربەدەریی و کاری داوێن پیسی پێکردن رزگاریان بکات... لەکاتێکدا ئافرەتانی دیلی جەنگ لە سیستمە کۆمەڵایەتیەکانی تردا سووك و ڕیسوا و بێ ڕێز دەکران و لەناو زەلکاوی داوێن پیسیدا نوقوم دەکران، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە ئەم ئافرەتانە بەخێوکەر و سەرپەرشتیاریان نیە و گەورەکانیشیان گوێ نادەن بە شەرەف و ناموسیان و غیرەت و جۆش و خرۆشیان ناجوڵێت بۆیان، بەو جۆرەی کە لەبەرامبەر خێزانەکانی خۆیاندا هەیانە، بەڵکو دوای بە دیل کردن و کۆیلە کردنیان کاری داوێن پیسی و زینایان پێ دەکەن و، بەم کارە پیس و بۆگەنەشیان خەریکی پارە پەیدا کردن و بازرگانی کردن و بەزاندنی سنوری حەرامکراوەکانن!!

بەڵام ئیسلامی مەزن و شارستانی ڕازی نەبوو بەم بەدڕەوشتیە، ئەم ڕێگەیەی نەگرتەبەر لەگەڵ کەنیزەکەکاندا، بەڵکو پێداگربوو لەسەر پاراستنی ناوبانگ و ڕەوشتییان، هەروەك چۆن پێداگربوو لەسەر پاك و خاوێنی کۆمەڵگا لە گلاوی زیناکاریی و بڵاوبونەوەی بەرەڵایی، تەنها و تەنها گەورەکانیان بۆیان هەبووە لەگەڵ کەنیزەکەکاندا بن و پێویست بووە لەسەری کە خواردن و پۆشاکیان بۆ دابین بکات و لە تاوان بیان پارێزێت و پێویستییە سێکسیەکانیان تێربکات ئەمە جگە لەو مامەڵە جوانەی کە لەگەڵیاندا دەکرا، هەتا دەگەیشتنە ئەو قۆناغەی

کە لەناخەوە هەستیان بەوە دەکرد کە ئیتر کاتی بەدەستهێنانی ئازادیە، دەهاتن داوایان لەخاوەنەکانیان دەکرد کە بەگوێرەی سیستمی موکاتەبە (کە ئیسلام دای نابوو) ئازادیان بکەن، خۆ ئەگەر لای گەورەکەی مایەوە و دووگیان بوو، وە بوو بە دایکی منداڵێك، ئەوە کەوتۆتە سەر ڕێگای ئازادبوون، بەڵکو وەك خێزانی پیاوەکەی لێدێت، ئەویش بەهۆی ئەو مافانەی بەدەستیان دێنێتو ئەو ڕێزەی لێی دەگیرێت.

ئەمە لە کوێ و ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیانەی تر لە کوێ، کە بەچاوێکی سووك و کەم بایەخەوە تەماشای کەنیزەك دەکات، بەوەی کە ناچاری دەکرد لەسەر ئەنجامدانی کاری داوێن پیسی و کرابووە کاڵایەکی هەرزان لەبازاڕی خراپەکاری و داوێن پیسیدا.

ئەمڕۆیش وڵاتە ئەوروپی و ڕۆژهەڵاتیەکان ڕێگایەکی تری کۆیلەکردنی ئافرەتانیان گرتۆتە بەر، کورتەی ئەم ڕێچکەیەش ئەوەیە کە ئەو سیستمانە ڕێگەیان داوە بە داوێن پیسی و یاسایان بۆ داناوە و هەر وڵاتێك دووپێی داگیرکارانەی ئەو وڵاتانەی تێ کەوتبێت ئەم کارانەیان تێدا بڵاو کردۆتەوە.

جا ئێستا دەبێت بپرسین: کامەیە ئەو گۆڕانکارییەی کە بەسەر کۆیلایەتیدا هات کاتێك ناونیشانەکەی گۆڕا؟ کەرامەتی ئەو ئافرەتە لەکوێیە کە داوێن پیسی لەگەڵدا دەکرێت و مافی ئەوەی نییە هیچ بکات؟ ئەم قێزەونیە جەستەیی و دەروونیەی نێوان گەورە و کەنیزەکەکان لەکوێ و ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە لەکوێ؟

بەڵێ ئیسلام ڕاشکاوبوو لەگەڵ خۆیی و خەڵکیشدا، کاتێك وتی: ئەوە کۆیلەیە و ئەوانەیش کەنیزەکن و سنوری مامەڵە کردنیش لەگەڵیان

ئەوە و ئەوەیە بەڵام نەی وت ئیتر هەتا هەتایە مرۆڤایەتی دەبێت وابێت، نەی وت ئەمە ئەو دۆخەیە كە شایانی كەرامەتی ئەم كۆیلەو كەنیزەكانەیە لە داهاتوودا، بەڵكو وتی: ئەمە پێویستیەكی جەنگە، كاتێك بەكۆیلەكردنی دیلی جەنگ لەناو خەڵكدا دەبێتە باوی سەردەم.

بەڵام ئەو شارستانیەتە پوچەی لەم سەردەمەدا هەیە ئەم ڕاشكاوییەی لە ناخی خۆیدا هەڵنەگرتووە، ئەو بە بەرەڵایی و داوێن پیسی ناڵێت كۆیلایەتی، بەڵكو دەڵێت ( ئەمە پێویستیەكی كۆمەڵایەتیە )

## ئەی ئەم پێویستیە بۆچـــی؟

لەبەر ئەوەی پیاوی ئەورووپی شاری و ڕۆژهەڵاتی سەرسام بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا نایەوێت سەرئێشەی بەخێوكردن و سەرپەرشتی كردنی خێزان بۆخۆی دروست بكات... ئەو تەنها ڕابواردن و چێژوەرگرتنی دەوێت بێ ئەوەی ئەم كارەی هیچ بەرپرسیارێتیەكی لەسەر دروست بكات... لاشەی ئافرەتی دەوێت بۆ خاڵی كردنەوەی حەزە سێكسیەكانی خۆی، بەلایەوە گرنگ نییە ئەو ئافرەتە كێیە و چی هەستێكی هەیە بەرامبەری و ئەمیش چی هەستێكی هەیە بەرامبەر ئەو ئافرەتە، ئەو ئافرەتە تەنها جەستەیەكە و بەبێ ویستی خۆی ئەو پیاوە وەك ئاژەڵ لێی دەپەڕێت و سواری دەبێت، ئەمەی بەسەری دێت تەنها لەلایەن یەك كەسەوە نییە، بەڵكو هەركەس ڕێی تێی بكەوێت ئەمەی لەگەڵدا دەكات.

ئا ئەمە ئەو پێویستیە كۆمەڵایەتیەیە كە لە چاخی نوێدا لە ڕۆژهەڵات و رۆژئاوادا ڕێگە دەدات بە كۆیلەكردنی ئافرەتان.

ئەی ئەو پێویستیە کۆمەڵایەتیە کامەیە کە وابکات پیاوی رۆژئاوایی یان رۆژهەڵاتی بگاتە ئاستی (مرۆڤبوون) و حەزو ئارەزووەکانی ئەم هەموو دەسەڵاتەیان نەبێت بەسەریدا.

ئەو وڵاتە رۆژئاواییانەی کە بانگەشەی شارستانیەت دەکەن و داوێن پیسیان هەڵوەشاندەوە، لەبەرئەوە ئەوکارەیان نەکرد چونکە کەرامەتیان ئازاری داون، یاخود ئاستی ئەخلاقی و دەرونی و رۆحیان ئەوەندە بەرزبوەتەوە کە ئیتر دەرهەق بە ئافرەتان تاوان نەکەن، یاخود وابەستەی سێکس نەبن، نەخێر، بەڵکو لەبەر ئەوەیە دۆخەکە گەیشتۆتە قۆناغێکی ئەوتۆ کە چیتر پێویست بەوە ناکات دەوڵەت دەستی تێ بخات.

دوای هەموو ئەم شەرمەزاریانە هێشتا رۆژئاوا دێت و کەش و فش و شانازی دەکات بەسەر موسوڵماناندا و رەخنە لە سیتمی کەنیزەك لە ئیسلامدا دەگرێت کە هەزارو سێسەد ساڵ لەمەوبەر هەبووە - کە سیستمێکی کاتی بووەو قابیلی گۆڕانە - کە زۆر زۆر رێزدار ترو پاك ترە لەو سیستمەی لە سەدەی بیستدا پەیدابووە و ئەو شارستانیەتەی ئێستا وا هەژمار دەکرێت کە سیستمێکی پێشکەوتنخوازە و کەس نکوڵی لەو ڕاستیە ناکات و هەوڵ نادات بۆ گۆڕینی و کەسیش رێگر نیە لەوەی ئەو سیستمە بۆ هەتا هەتایە بمێنێتەوە و هەتا ئەوکاتەی ئەم پاڵنەرە سێکسی و رۆچوون لە چێژوو خۆشیە سێکسیانەی مرۆڤ هەبن ئەم سیستمەیش بەردەوام بێت!!

گومانی تێدا نییە ئەو بارودۆخە خراپ و داوێن پیسیەی کە لە شارستانیەتی رۆژئاوادا هەیە، بوەتە هاندەرو پاڵنەری بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی و دانپێدانانی، جا ئەو داوێن پیسیە یاسایی بێت یاخود نا یاسایی بێت.

ASTANA

ئەمە چیرۆکی کۆیلایەتی سەدەی بیستەمە لە ئەوروپا و وڵاتانی تردا: بە کۆیلەکردنی پیاو، بەکۆیلەکردنی ئافرەت، بەکۆیلەکردنی نەتەوەکان، بەکۆیلەکردنی رەگەزەکان.... بەکۆیلەکردنی فرە سەرچاوە، بەردەوام سەرچاوەکانی بەکۆیلەکردن تازە دەبنەوە بەبێ هەبوونی پێویستی یان ناچارییەکی زۆر... هیچکام لەو پێویستیانە بونیان نییە، ئەوەی هەیە تەنها خوێڕیەتی رۆژئاوا و سوکی و بێنرخی رۆژهەڵاتە، ئامانجی گڵاویانە بۆ دەسەڵاتداری و نزمبونەوەیان لە رێگای داوێن پیسی و پێشێل کردنی کەرامەتی مرۆڤ....

## ئەی ئەو کەسانەی بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێن

ئەمەبوو سیستمی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا: لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە مێژووی مرۆڤایەتی و شانازیەکی گەورە لە تۆماری مرۆڤایەتیدا، خۆتان بینیتان ئیسلام هەموو ڕێگا ئیجابیەکان و بنەما یاساییەکانی گرتۆتە بەر بۆ ئازادکردنی کۆیلە، هەموو سەرچاوە کۆنەکانی بەکۆیلەکردنی وشك کردووە بۆ ئەوەی جارێکی تر دووبارە نەبنەوە، تەنها یەك سەرچاوەی هێشتۆتەوە کە بریتیە لە کۆیلەکردنی دیلی جەنگ کاتێك جەنگەکە جەنگێکی شەرعی بێت ...، ئەم سەرچاوەیەیشی لەبەر پێویستی جەنگ وشك نەکردووە، کە ڕەنگە هەر پێویستیشی نەبێت پەنای بۆ بەرێت، یان لەبەر پێویستیەکی کۆمەڵایەتی کە ڕەنگە خێر لە هێنانەدی ئەو بەرژەوەندیەدا هەبێت بەهۆی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە وڵات و نەتەوەگەلێکەوە کە ئیسلام دەسەڵاتی بەسەریاندا ناشکێت، یاخود پەیوەستە بەبەرژەوەندی نەتەوەیەکەوە کە وەکو یەك خێرو خۆشی دەهێنێت بۆ پیاوو ئافرەتیان.

هەروەها بینیتان کە یەکێك لە گەورەییەکانی شەریعەتی ئیسلامی لە بواری سیستمی کۆیلایەتیدا ئەوەبوو کە پێشەوای موسڵمانانی سەرپشك کردووە بە بەکارهێنانی دەسەڵاتە فراوانەکانی لەگەڵ دیلی جەنگ، بە هەڵبژاردنی یەکێك لەم چوار حاڵەتە: ئازادکردنی بە منەت یان بە بریتی یان کوشتن یان کۆیلە کردن، لەسەر ئەم بنەمایەش گەورەی موسڵمان بۆی هەیە لەگەڵ وڵاتانی ناموسوڵماندا

ASTANA

پەیماننامە ببەستێت بۆ ڕێگری کردن لە بە کۆیلەکردنی دیلەکان لە هەموو جۆرە جەنگێکدا، هەروەك) محمد الفاتح (لەگەڵ دەوڵەتەکانی سەردەمی خۆیدا ڕێك کەوت لەسەر کۆتایی هێنان بە بەکۆیلەکردن.

لەو ساتەدا کە ئەم ڕێکەوتنە تیایدا ڕوودەدات ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ بنەما گەورەکەی خۆی کە بەوپەڕی ڕاشکاویەوە بڕیاری لەسەرداوەو دەڵێت: ئازادی بۆ هەموان، یەکسانی بۆ هەموان [١] مافی ڕێزو کەرامەتی مرۆڤانە بۆ هەموان!!

ئەمە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئیسلام بە حەوت سەدە پێش رۆژئاوا کەوتووە لە ئازادکردنی کۆیلە، بەرلەوەی شۆڕشی فەرەنسی لە ئەوروپادا شانازی بکات بە ئازادکردنی کۆیلەوە، پێش ئەوەی ئەبراهام لنکۆڵن باسی ئازادکردنی کۆیلە بکات لە ئەمریکا، پێش ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان بنەماکانی مافی مرۆڤ لە جیهاندا رابگەیەنێت.

هەموو ئەمانە زیاتر ئەو باوەڕە لای کەسانی ژیری هۆشیار دەچەسپێنن کە ئیسلام دینی ئازادکردن و ئازادیە، بەرنامەی پاراستنی

---

(١) لەڕاستیدا ئیسلام عەدالەتی بۆ هەمووان هێناوە نەك یەکسانی، چونکە لە هەندێك کاتدا یەکسانی دەبێتە هۆی ستەم لە چینێك وەك ئەوەی بتەوێت بە پێوەری یەکسانی جل و بەرگ بۆ منداڵەکانت بکڕیت، لێرەدا ئەو بڕەپارەیەی تەرخانی دەکەیت بەیەکسانی لە نێوانییاندا بۆ بچوکەکان لەبەر کەمی نرخ چاك و گونجاوە، بەڵام بۆ گەورەکان نەگونجاوە، کەواتە تۆ لێرەدا ستەمت لە گەورەکان کرد، ئەگەر بڵێیت بڕێکی زۆر پارەیان بۆ تەرخاندەکەم ئەوا بچووکەکان دوای کڕینی جل و بەرگەکە هەندێك پارەیان بۆ دەمێنێتەوە لە کاتێکدا گەورەکان هیچییان بۆ نامێنیتەوە، لێرەشدا هەر ستەم ڕوویدا خوای گەورەش دەفەرمویێت: [ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ] واتە دادپەروەر بن ئەوە لە خواترسان و پێکانەوە نزیکە .. وەرگێڕ

كەرامەت و ژیانی مرۆڤە... تا ئەو كاتەی ژیان بەردەوامی هەبێت و گۆی زەوی مرۆڤی لەسەر بژی!!

جا ئیتر با ڕۆژهەڵاتناسان و ڕۆژئاوا پەرستان و شیوعیەكان و بێدینەكانی دوژمنی ئیسلام ئاگاداربن و بزانن كە ئەم ئیسلامە مەزنە دینی خوای نەمر و بەرنامە گشتگیر و سیستمە بەردەوام نوێ بوەوەكەیەتی.... كە خوای مەزن دای بەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەكەی)ﷺ)، بۆ ئەوەی لە ژێر سایەی بنەماكانی ئازادی و برایەتی و یەكسانیدا ببێتە هۆی هێنانەدی كەرامەتی مرۆڤەكان و بەختەوەری خێزان و یەكێتی كۆمەڵگە و سەقامگیری مرۆڤایەتی....

لەسەر بانگخوازانی ئیسلامی پێویستە لەهەر شوێنێك بن دەست بكەن بە جوڵەكردن بۆ دەرخستنی ڕاستیەكانی ئیسلام بۆ سەرجەم خەڵكی، پەردەی گومان و تراویلكەی تۆمەتباركردنی ئیسلام لەسەر چاوی خەڵكی لابەرن، بۆ ئەوەی كاتێك نیشانەكانی ڕاستی شتەكان دەركەوتن و بەڵگەكان ڕوون بونەوە بۆیان، ئیتر ئەو دەرونانەی سەرسام ماون بێنە ناو باخچەی باوەڕ و بەهەشتی پڕ لە دڵنیاییەوە و ببن بە یەكێك لەو باوەڕدارانەی كە بەهێزترین باوەڕ و جۆش وخرۆشیان هەیە بۆ ئیسلام و پڕبن لە وزە بۆ كاركرن و بانگەوازكردن و تێكۆشان لە پێناوی ئیسلامدا.

ئیمان بەم جۆرەیە، كاتێك خۆشیەكانی تێكەڵ بەدڵ بوون، ئیتر پاڵ بەخاوەنەكەیەوە دەنێت بۆ بەرزبوونەوە بەرەو بەرزترین پلەكانی كەماڵ و مەزنترین هەڵویستە قارەمانێتیەكان و باشترین پلەكانی لەخواترسان و شەیدایانی ڕێی خوا.

هەروەك چۆن قوتابخانەکەی محمد (ﷺ) کەسانی وەك ئەبا بەکر و عومەر و خالد و ئوسامە و خەنسا و دایکی عەمماری بەرهەم هێنا، ئەمیش کەسانی مەزن و نەمر بەرهەم دێنێت.

بۆیە - ئەی بانگخوازانی رێی ئیسلام - ئیتر بکەونە بزاوتی بانگخوازیی زیاتر و گەیاندنی رێنماییەکانی دین، بەڵکو گەنجانی موسڵمان ببینین واز لە گومڕایی بهێنن و بگەڕێنەوە بەرەو ئیسلام، بەڵکو لە ئاسۆوە سەرقافڵەی کاروانی ئیسلام ببینین کە دەکشێت و لەگەڵ خۆیشیدا سەربەرزی دزراوی ئیسلام و شکۆی ون بوویی و ئەو شارستانیەتەیشی هێناوەتەوە کە سەردەمەکان خامۆشیان کردووە. کە ئەم کارەیش بەلای خواوە قورس و گران نیە.

[وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ] التوبة ١٠٥.

واتە: ئێوە کار بکەن و خواو پێغەمبەرو ئیماندارانیش کارەکەتان دەبینن ..

دوایەمین نزاشمان

سوپاس و ستاییشی پەروەردگاری جیهانیانە

# ناوەڕۆك



ASTANA

## سیستەمی کۆیلایەتی

# لە ئیسلامدا

دوژمنانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا بە تایبەت "شیوعیەکان هەوڵ دەدەن تراویلکەیەک "سەراب" لە تۆمەت، و کەفاوێک لە گومان لەسەر سیستەمی ئیسلامی بوروژێنن، ئامانجیان لەمەش چاندنی لەناو نەوەی موسڵمانانندا. گومان دروستکردنە لای گەنجانی موسڵمان بەرامبەر ئەو سیستەمە خواییە، پاڵنانی نەتەوەی ئیسلامە بەرەو بێ ڕەوشتی ڕەها و لادانیانە بەرەو ئەوپەڕی بێ باوەڕی.

یەکێک لەو بابەتانەی دەوروژنرێت لە نێو ناوەندە ڕۆشنبیریەکاندا، ئەوەیە کە وا ئیسلام ڕێگەی داوە بە سیستەمی کۆیلایەتی، بە بۆچونی ئەوان ئەمە کۆت و بەندکردنی ئازادی مرۆڤەکانە، ئەم تۆمەتە درۆینەیان کردووەتە ئامرازێک بۆ چاندنی تۆوی گومان و تانەدان لە بنەماکانی ئیسلام، بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئامرازی گڵاویان، ئەگەر بتوانن، کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی ئیلحاد و بێ باوەڕی لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی و نەوەکانی دا.

